# هاوسەرگیریو جیابوونەوە

## لە یاسای عێراقیو شەریعەتی ئیسلامیدا

پرۆفیسۆر
دكتۆر كەمال سەعدی مستەفا

هەرێمی كوردستان – هەولێر
٢٠١٥ زاینی

ناوی کتێب: هاوسەرگیریو جیابوونەوە

دانەر: کەمال سەعدی مستەفا

بەرگ: عوسمان پیرداود

پیتچنین: دانەر

چاپخانە: منارە (هەولێر) تەلەفۆن (٠٧٥٠٣٨٥١٦١١)

چاپی یەکەم هەولێر ٢٠١٥

تیراژ: ٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٥٨) ی ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە.

# پێشکەشە بە:

## هەردوو زاناودانای گەورەی گەلەکەمان

## خوالێخۆشبووان:

- **پرۆفیسۆر دکتۆر سەعدی بەرزنجی**
- **پرۆفیسۆر دکتۆر محەمەد گەزنەیی**

کە بە زانستەکەیان خزمەتێکی زۆری ئێمەو قوتابیانی کۆلێژی یاساو کۆمەڵگەی کوردەواریو کتێبخانەی یاساییان لە کوردستان کردو ئەوان زیندوونو هەموو چرکەساتێك لە دڵو دەروونماندان.

# پێشەکی:

لە ساڵی ١٩٩٠ کاتێك خوێندنی یاسام تەواو کردو بڕوانامەی بەکالۆریۆسم لە یاسا وەرگرت، لەسەر داوای خۆم لە وەزیفە خانەنشین بوومو پەیوەندیمکرد بە سەندیکای پارێزەرانی عیراقو ناسنامەی پارێزەریم وەرگرتو لە ژووری پارێزەرانی شاری هەولێر ناوی خۆم تۆمارکردو دەستمکرد بە کاری پارێزەری. جا ئەوەبوو بۆ ماوەی زیاتر لە چوار ساڵ ئەم کارەم کردوو لەو ماوەیەدا هەستم بە کەموکورتییێکی زۆر کرد لە یاسای باری کەسیی عیراقیدا کە بە هۆیەوە زۆر خانەوادە ڕووبەڕووی لێکترازان بوونەوە بە هۆی لێکجیابوونەوەی هاوسەرەکان کە لەو زیانانەشدا پشکی شێر بەر منداڵەکانی ئەو خانەوادانە دەکەوت، لە کاتێکدا ئەگەر یاساکە بەو شێوەیەی ئێستای نەبوایە ڕەنگ بێ بەشێك لەو پەیوەندییە هاوسەرگیرییانە دوای پچڕانیان بە ئاسانی وەکو خۆی لێ بهاتایەتەوە، بۆیە کاتێك خوێندنی باڵام تەواوکرد، بیرۆکەی دانانی کتابێکم لەو بوارەدا بە خەیاڵدا هات، بۆ ئەم مەبەستە لەساڵی ١٩٩٨ پەیوەندیم کرد بە خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر دکتۆر محەمەد گەزنەیی کە پسپۆر بوو لە بواری شەریعەتو یاسای بەراورداو داوام لێی کرد کە بەیەکەوە ئەم پرۆژەیە ئەنجام بدەینو بیکەینە کتابێکی مەنهەجی بۆ ئەوەی لە کۆلێژی یاسا بخوێندرێت. خوالێخۆشبوو بیرۆکەکەی زۆر پێ باش بوو، بۆیە دەمودەست پەسندی کردوو بەیەکەوە یاداشتنامەیەکمان ئاراستەی ڕاگری کۆلێژ، خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر دکتۆر سەعدی بەرزنجەیی کرد.

شـایەنی ئاماژەبۆکردنـە، بیرۆکەکـەی پـێ بـاش بـوو بـەلاّم پێشـنیاری کـرد لەگەڵ ئەو ئەنجامی بدەم، بۆیە داوای لێکردم واز لـە دکتـۆر محەمـەد گەزنـەیی بێـنمو یاداشتنامەیەکی تر پێشکەش بکەم. جا ئەوەبوو، ووتم باشە بـەلاّم دەبـێ پرسـێك بـە دکتۆر گەزنەیی بکەم، ئەوەبوو چوومە لای نـاوبراوو پێشـنیارەکەی ڕاگـرم پێـی ووت، هەرچەندە دکتۆر محەمەد گەزنەیی پێی نـاخۆش بـوو، بـەلاّم لاری نـەبوو، ووتـی تـۆ خاوەنی بیرۆکەکەی بۆیە هیچ لێت عادزنابم.

بەهــەرحاڵ، هــەرخۆم پلانــێکم بـۆ دانـانی کتابەکـە دانـاو لەگـەڵ نووسـراوێك هاوپێچم کردو بۆ ڕاگر بەرزم کردەوە ئەویش ڕەوانەی لیژنەی زانستی کۆلێژی کـرد بـۆ ڕەزامەندییان، جا ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێکی کەم، لیژنـە، کـە خوالێخۆشـبوو دکتـۆر محەمەد گەزنەیی سەرۆکایەتی دەکرد ڕەزامەندی لەسەر پلانی تۆژینەوەکە نوانـدو بـۆ ئەنجوومەنی کۆلێژو دواتر بۆ سەرۆکایەتی زانکـۆ بەرزکرایـەوە. بـەم شـێوەیە لـەوێش لیژنـەی دانـانی کتێـب ڕەزامەنـدی نوانـدو فـەرمانی زانکۆییمـان بـۆ دەرچـوو، بـەلاّم بەداخەوە لەبەر سەرقاڵی خوالێخۆشبوو دکتۆر سـەعدی بەرزنجـەیی بـە ئـیشو کـاری ڕاگرىو دواتر بوونی بە سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدد ین، ناوبراو نـەیتوانی کـارم لەگـەڵ بکات بۆیە منیش لە پڕۆژەکە سارد بوومەوە تـا ئـەم سـالاّنەی دوایـی جارێکی تـر بـە ناونیشانێکی ترەوە درێـژەم بـە نووسـینەکەم دایـەوەو بـەم شـێوەیەی ئێسـتا کـە لـە بەردەستتان دایە ئەنجامم دا، هیوادارم خزمەتێکی بچووکم پێشکەش بـە یاساناسـانو مافپەروەرانو قوتابیانی زانکۆو کتێبخانەی کوردی کردبێت. هەر بەم بۆنەیەشـەوە لـە

خوای گەورە داواکارم گیانی پاکی ئەو دوو کەڵە زانایە بە بەهەشتی پان‌و بەرین بسپێرێت کە بە زانستەکەیان مێشکی ئێمەو سەدان قوتابی زانکۆیان ڕوناك کردەوە.

دانەر

پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال سەعدی مستەفا

## خوازبێنی و هاوســەرێتی :

لەبەر گرنگێتی و پیرۆزی گرێبەندی هاوسەرێتی یاسادانەر هەندێك حـوكمی تایبــەتی بـۆ دانــاوە بەمەبەســتی زامنكردنــی بەختــەوەری و ســەقامگیری بــۆ هاوسەرەكان، یەكێك لەو حوكمانە تایبەتە بە خوازبێنی .

خـوازبێنی داوای پیاوێكـە بـۆ هێنـانی ئـافرەتێكی دیـاری كـراو، لـەڕێگای چوونەوە پێشەوە لەخۆی یان لەكەس وكاری داوا دەكات بیهێنێت.

خـوازبێنی بـەزۆری لكـاوە بـە خوێندنـەوەی سـوورەتی فاتیحـە لـەنێوان خوازبێن (الخاطب) و وەلیی دەزگیرانەكە (المخطوبة).

مەبەسـتیش لەمـە دەربـڕینی ڕەزامەنـدی یـە بـۆ خۆلەیـەك بەسـتنەوە و چەسپاندنی بەڵێنی هاوسەرێتی یە لەنێوانیاندا [١] .

هەروەها لەشەریعەتی ئیسلامیشدا خوازبێنی بە گرێبەند دانانـدرێ بەڵكو بەڵێندانی هاوسەرێتی یە هەرچەندە بەڕەزامەندی هەردوو لا پێك دێت [٢] .

كەواتە خوازبێنی دوای ئەنجامدانی نە بەگرێبەنـدوە نـە بـە هاوسـەرێتی ی دانانـدرێ بـەڵكو بـەڵێنی هاوسـەرێتی یـە، چـونكە هاوسـەرێتی ی هەنـدێك ڕایـەڵ ومەریجی هەیە بریتی یە لەپێشەكیەك بۆ هاوسەرێتی ی هەروەكو لـە بڕگـەی سـێ ی مادەی سێی یاسای بـاری كەسـیی عێراقیـدا هـاتووە : (( بـەڵێنی هاوسـەرێتیی وفاتیحە خوێندن و خوازبێنی بەگرێبەندی هاوسەرێتی دانادرێن)) .

---

[١] - د . احمد علی و الآخرون : شرح قانون الاحوال الشخصية ، وزارة التعليم العالی و البحث العلمی ، ط/١، سنة ١٩٨٠ ، ل ٢٤.

[٢] - د . عبد الرحمن الصابونی : شرح قانون الاحوال الشخصية الوری ، مديرية الكتب الجامعية ، بلا سنة الطبع ، ل ٣٤.

لە دوو خاڵدا باسیان لێوەدەکەین، خاڵی یەکەم تەرخان دەکەین بۆ باسکردنی خوازبێنیو ئاکامەکانیو خاڵی دووەمیش تەرخان دەکەین بۆ باسکردنی هاوسەرێتیو ئاکامەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە:

**یەکەم: خوازبێنی و ئاکامەکانی**

خوازبێنی و بەڵێندانی هاوسەرێتی و فاتیحە خوێندن سێ دەستە واژەن یەك واتا دەبەخشن بەمانای ئەوە دێ کەهێشتا گرێبەندی هاوسەرێتی نەبەستراوە، بەڵکو تاکو ئێستا کارەکە لەقۆناغی پرس پێککردن وڕاوێژکردن دایەو بەڵێنێکی ناسەپاوەیە لەڕووی دادگەری یەوە .

بەڵام سەرەڕای ئەمەش دەبێتە هۆی هێنانەکایەوەی هەندێك ڕووداو کە ئەمانیش بەدەوری خۆیان هەندێك ئاکامیان دەبێت کە بریتین لە هەندێك ماف و ئەرك. هەر ئەمەش وای کردووە کە یاسازانان بایەخێکی زۆری پێبدەن.

ئێمەش لێرەدا بەپێویستی دەزانین بیخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە لە چەند خاڵێکدا، لە خاڵی یەکەم باس لە سروشتی خوازبێنی دەکەینو لە خاڵی دووەمیشدا باس لە ڕەوایی خوازبێنی دەکەینو خاڵی سێیەمیش تەرخان دەکەین بۆ باسکردنی مەرجە بابەتیەکانی خوازبێنیو لە خاڵی چوارەمیشدا ئاکامەکانی خوازبێنی دەخەینە ڕوو، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**١- سروشتی خوازبێنی**

هیچ گومانی تیانیە کە خوازبێنی بە گرێبەند داناندرێ هەروەها بە هاوسەرێتیش داناندرێ هەروەها لایەنەکانیشی بۆبەستنی گرێبەندی هاوسەرێتی هیچ زۆرییان لێ ناکرێ ، بەڵکو بەڵێنێکە بۆ هاوسەرێتی چونکە هاوسەرێتی هەندێك

ڕایەڵ و مەرجی پێویستە کە بەبێ ئەوان نایەتەدی بۆیە لەبەر هەبوونی ئەو ڕایەڵ ومەرجانە ئەوەی هەیە بەگرێبەندی هاوسەرێتیی داناندرێ بەڵکو پێشەکیەکە بۆ هاوسەرێتیی [1].

شایەنی وتنە، هەروەکو لەپێشەوە گوتمان بەڵێنی هاوسەرێتی و فاتیحە خوێندن ئەو ڕایەڵانەی تیا نیە کە دەبێ لەگرێ بەندەکەدا هەبێ **کەئەمانەن** : ڕەزامەندی (الرضا) و بابەت (المحل) و هۆکار (السبب)، هەروەها سەرەڕای مەرجە بابەتیەکانی بەستنی گرێبەست، پێویستە لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا ڕایەڵی شکلی جێ بەجێ بکرێت، مەبەستمان ئەو شێوەیەیە کەیاسا دەستیشانی کردووە [2].

ئەگەر بێت و سەیری یاسای باری کەسیی عیراقی بکەین دەبینین بەڕاشکاوەیی لەبڕگەی /٣ی مادەی /٣ خوازبێنیو فاتیحە خوێندنی بە گرێبەند دانەناوە و دەڵێ : (( بەڵێنی هاوسەرێتی و فاتیحە خوێندن و خواز بێنی بە گرێبەندی هاوسەرێتی داناندرێ )).

## ٢- ڕەوایی خوازبێنی

یاسای باری کەسیی عیراقی سەبارەت بەخوازبێنی و فاتیحە خوێندن لەوە زیاتر کە لەبڕگەی سێی ماددەی سێدا ئاماژەی پێکردووە هیچی تری لەم بارەیەوە باس نەکردووە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە یاسا دانەر ئەو حوکمەی بۆ بنچینە گشتییەکان ( القواعد العامة ) لەیاسای شارستانی هەروەها شەریعەتی ئیسلامی بەجێهێشتووە. بەڵام لەشەریعەتی ئیسلامدا ڕەواییێتی خوازبێنی و بەڵگەی حوکمەکەی بەقوڕئانو سوننەوە بەستۆتەوە.

---

[1] - د . عبد الرض الصابونی : شرح قانون الاحوال الشخصية السوری ، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

[2] - فريد فتيان : شرح قانون الاحوال الشخصية ، ط / ٢، دارواسط ، ، لندن ١٩٨٦ ، ل ٣٩ .

خوا ئەفەرموێ : ((وَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُمْ بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ..))[1] واتە گونا حێکتان لەسەر نیە کە ژنان تێ بگەیەنن و خوازبێنیان بکەن .. هەروەها پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی : (( لایخطب احدکم علی خطبة اخیه ))[2] واتە کەسێك داخوازی دەزگیرانی برادەرەکەی نەکات.

## ٣- مەرجە بابەتیەکانی خوازبێنی

### أ- لایەنەکانی خواز بێنی

لایەنەکانی خوازبێنی بریتین لە هەردوو دەستگیران ، خوازیار یان بخوازو خوازراو دەشێت لەجیاتی ئەوان ئەوکەسانەی کە سەرپەرشتیان دەکەن (ولی امر) ڕەزامەندی بنوێنێت .

هەروەکو لەوەو پێش وتمان یاسادانەری عیراقی لە یاسای باری کەسی دا ئەمەی ڕێك نەخستووە بۆیە دەبێ لەم بارە یەوە بگەڕێینەوە بۆبنچینەکانی شەریعەتی ئیسلامی، هەروەکو لە بڕگەی دووی مادده یەکدا داهاتووە:((ئەگەر دەقێکی دانراو بۆ پیادەکردن نەبوو، پێویستە پشت بە گونجاوترین بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام کەزیاتر لەگەڵ دەقەکانی ئەم یاسایەدا دەگونجێت ببەسترێت)).

بۆیە بەپێی حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلام ئەگەر هاتوو مرۆڤێك ئارەزووی هێنانی ئافرەتێکی هەبوو کە لەوەو پێش نەیبینیبێ بۆی هەیە بەرلەهێنانی بیبینێت .

---

[1] - سورەتی بەقەرە (٢٣٥).

[2] - صحیح مسلم ج/١ ص٥٩١.

لەم بارەیەوە دەگێڕنەوە المغیر بن شعبە خوازبێنی ئافرەتێكی كرد پێغەمبەر (د.خ ) پێی ووت : ((انظر اليها فأنه احرى ان يؤدم بينكما ))[1] واتە: ((بۆئەوەی سۆزوخۆشەویستی لە نێوانیاندا بەردەوام بێت)).

هەروەها چۆن خوازیار و خوازراو بۆیان هەیە سەیری یەكتر بكەن . زۆربەی یاسازانە موسڵمانەكان بۆئەوە چوونە كەدەبێ سەیری دەموچاوو پەلەكان بكرێ ، هەندێكیش لە حەنەفیەكان بۆئەوە چوونە كەدەكرێ سەیری لاقەكان بكرێ . بەڵام حەنەفیەكان زیاتر لەوە ڕێگایان داوە سەیری باسكەكان و قاچەكان بكەن چونكە ئەم شوێنانەی ئافرەت لەكاتی كاركردنیدا بەدیار دەكەوێ بەڵگەشیان بۆئەمە ئەوەیە كە پێغەمبەر (د.خ) ڕێگای داوە ئەو ئافرەتە ببینێ كە دەیەوێ بیهێنێ بێئەوەی ئاگای لێبێت، بەشێوەیەكی ئاسایی كاتێك ئافرەت كاردەكات، ئەگەر دڵنیابێت كەسێك نایبینێ، ئەو شوێنانەی خۆی بەدیار دەخات[2] .

## ب- تەمەنی خوازبێنی ( سن الخطوبة )

یاسازانانی موسڵمان تەمەنێكی دیاریكراویان دانەناوە بۆ هاوسەرێتی بۆیە ئاساییە كە تەمەنێكی دیاریكراویشیان بۆ خوازبێنی دانەنابێت . بەڵام یاسای باری كەسیی عیراقی لەبڕگەی یەك ماددەی حەوت دا لێهاتنی هاوسەرێتیی بە هەژدە ساڵ داناوە[3] .

---

[1] - نبيل الاوطار: ١٧/٦ نقلا عن نظام الدين عبدالمجيد، احكام الاسرة في فقه الاسلامي، احكام النكاح، ط/١، مطبعة جامعة يغداد، ١٩٨٦، ل١٥، هامش/٢.

[2] - نظام الدين عبدالمجيد: هەمان سەرچاوە، ل١٦.

[3] - مادده/٧ی یاسای باری كەسیی عێراقی دەڵێ : (( ١- مەرجی تەواوی لێهاتوویی هاوسەرێتی ، هۆش و تەمەنی هەژدە ساڵی یە )) .

هەروەها بەپێی ماددە هەشت دادوەر بۆی هەیە ڕێگا بەو كەسە بدات كە تەمەنی پانزە ساڵی تەواو كردوە دوای سەلماندنی لێهاتنەكەی و توانای جەستەیی و دوای ڕەزامەندی سەرپەرشتیارە شەرعیەكەی گرێبەستی هاوسەرێتی ببەستێ[1] ، بەم پێیەو لەبەر ئەوەی خوازبێنی پێش هاوسەرێتییە ، كەوابوو خوازبێنی دەبێت پێش ( ١٥ ) ساڵی بێت .

## ج- شێوازی داخوازی

هەروەكو لەوەو پێش ئاماژەمان پێ كرد داخوازی بەمانای داواكردنی پیاوێك بۆ هێنانی ئافرەتێك دێت كە بەپێی شەرع بۆی حەلاڵ بێت .

ئەگەر هاتوو ئارەزووی پیاوەكە لە ڕێگای ڕەزامەندی ئافرەتەكە یان كەسی ئەو ئافرەتە هاتە دی و ڕەزامەندی خۆیان لەسەر ئەم داخوازیە نواند ئەوا دەبێتە بەڵێنێك لەنێوان هەردوو دەسگیرانەكە بۆ هاوسەرێتیی لە ئایندەدا .

ئەم داخوازیەش لەوانەیە لە ڕێگای بەكارهێنانی دەستەواژەیەكی ڕاشكەوەوە بێت بۆ نموونە پیاوێك بەئافرەتێك دەڵێ داوای دەستت دەكەم تاكو ببیتە هاوسەرم .

هەروەها دەشكرێ داخوازی بە ناڕاشكاوەیی بێت كاتێك پیاوەكە قسەیەك دەكات زیاتر لە مانایەك ببەخشێت . بۆ نموونە بە ئافرەتەكە دەڵێ نیازم وایە

---

[1] - لەماددە /٨ی یاسای باری كەسیی عێراقیدا هاتووە : (( ئەگەر كەسێك تەمەنی پانزە ساڵی تەواو كردو داوای بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتی كرد ، دادگا بۆی هەیە رێگەی پێبدات ، ئەگەر بۆی سەلمێندرا كە لێهاتوویی هاوسەری و توانای جەستەیی هەیەو دوای ڕەزامەندی سەرپەرشتیارە شەرعیەكەی . ئەگەر سەرپەرشتیارەكەی ڕازی نەبوو ، دادوەر لەماوەیەكی دیاری كراو داوای ڕەزامەندی لێ دەكات ، ئەگەر لاری نەبوو یان لارییەكەی شایەنی ڕەچاو كردن نەبوو دادوەر ڕێ بە هاوسەرێتی یەكەی دەدات )).

داخوازی ئافرەتێك بکەم جوان و نەشمیل و ژیـرو دەرچـووی زانکۆیـە ، ئافرەتەکـە ش ئەم هەموو سیفەتانەی تیایە .

لەکۆتاییدا دەتوانین بڵێین مەرج نیە داخوازی بە شێوازێکی دیاریکراو بێـت ، بـەڵکو دەکرێ بە هەر شێوازێك بێت کە ئەو واتایە ببەخشـێت هـەروەکو لـە سـەرەوە ڕونمـان کردۆتەوە.

## د- بابەت یان ناوەڕۆکی خوازبێنی ( محل الخطوبة )

دروسـتکردنی پەیوەنـدی دەسـگیرانی بابـەتی خوازبێنییـە و دەبـێ ئـەم مەرجانـەی خـوارەوە لـەو کەسـانە بێـت تـاکو بـە بخـوازو خـوازراو بشـێت چـونکە خوازبێنی پێشەکییە بۆ هاوسەرێتی بۆیە ئـەو کەسـەی بـۆ هاوسـەرێتی نەشـێ بـۆ خوازبێنیش ناشێت .

کەواتـە هـەموو ئافرەتێـك بـۆ خـوازبێنی ناشـێت بۆیـە لـەم ڕووەوە دەتـوانین ئافرەتان بکەینە سێ بەش :

١- ئەو ئافرەتانەی دەکرێ خوازبێنی بکرێن لەبەر نەبوونی هۆیەك لـە هۆیـەکانی پێـك نەشیانی هەمیشەیی یان کاتی وە ئەوانەش زۆرینەی ئافرەتانی کۆمەڵ پێك دێنن .

٢- ئەو ئافرەتانەی کە ناکرێ خوازبێنی بکـرێن لەبـەر پێکنەشـیانی هەمیشـەیی بەهۆی خزمایەتی وەك خوشك و پلك ( خوشکی باوك و خوشکی دایك )، یان بـەهۆی زاوایەتی وەك دایکی ژنەو خوشك و کچی خوشك شیر پێدراو (ألرضاعیات)[1] .

---

[1] - لەدەقی مادده /١٣ی یاسای باری کەسـیی عێراقیـدا هاتووە:(هۆیـەکانی پێکنـە شـیان دوو جـۆرن، پێکنـە شیانی هەمیشەیی و کاتی .پێکنە شیانی هەمیشەیی بریتییە لە خزمایەتیو زاوایەتیو شیر پێدان.. ).

٣- ئەو ئافرەتانەی ناکرێ خوازبێنی بکرێن لەبەر کۆسپ[1] ، ئەگەر کۆسپەکە نەما دەکرێ داخوازی بکرێن، وە ئەوانیش ئەم پۆلانەی خوارەوەن :

١- ئەو ئافرەتەی بە هاوسەرێتییەکی دروست بەسترابێتەوە .

ب- ئەو ئافرەتەی لەعیددەی تەلاّقی بەرگەڕانەوە ( رجعي ) دایە .

ج- ئەو ئافرەتەی لە عیددەی تەلاّقی جوداکەر ( بائن ) دایە .

د- ئەو ئافرەتەی لە عیددەی مردن دایە[2] .

هـ- دەسگیرانی یەکێکی تر .

## ٤- ئاکامەکانی خوازبێنی

ئەنجامی خوازبێنی لە یەکێك لەم دوو ئەگەرەی خوارەوە بە دەر نیە :

١- کۆتایی هاتنی خوازبێنییەکە بە هاوسەرێتی .

٢- پاشگەز بوونەوە لە خوازبێنییەکە و هەڵوەشاندنی .

کۆتایی هاتنی خوازبێنییەکە بە هاوسەرێتی پێویست بە تۆژینەوە ناکات چوونکە لەمەو دوا بە درێژیو چڕوپڕی باس لە ئەحکامەکانی هاوسەرێتی دەکەین بۆیە لێرەدا تەنیا باس لە خاڵی دووەم دەکەین کە ئەویش پاشگەز بوونەوەیە لە خوازبێنی :

---

[1] -لەمادده /١٣ی یاسای ناوبراودا هاتووە : (( ... پێکنە شیانی کاتی بریتییە لە حاڵەتی کۆکردنەوەی زیاتر لەچوار ژن و بێئاینی ئاسمانیو سێ بەسێ تەلاقدان و بونی مافی کەسی بێگانە لە هاوسەرێتی ژنەکە یان بەعیددەکەی و ژنهێنانی نەشیاوێك لەگەڵ لەئارا دابوونی هاوسەرێتی بە ئەوەکەی دیکە)).

[2] - لەبڕگەی /٣١ی مادده/٤٨ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە : (( عیددەی ئەوژنەی کە مێردەکەی مردووە ، چوار مانگ و دەڕۆژە بۆژنی یەك گیان ، بەڵام بۆژنی سکپڕ (دووگیان) یەك لە دوور ترینی ئەم دوو ماوەیەیە یا هەتامنداڵ بوونەکە یان ماوە دیاریکراوەکەیە)).

## أ- پاشگەزبوونەوە لە خوازبێنی

پیاوێك داوای دەستی ئافرەتێك بكات ئافرەتەكەش ڕازی بێت لەسەر ئەو داوایە پێی دەوترێ بەڵێنی هاوسەرێتی و مانای بەستنی گرێبەند ناگەیەنێ ، واتە هەردوو لایەنەكە بۆیان هەیە هۆیەك هەبێ یان نەبێ ڕای خۆیان سەبارەت بە خوازبێنییەكە بگۆڕن ، لەم بارەیەوە لەبڕگەی (٣) مادده (٣) یاسای باری كەسیی عیراقیدا هاتووە:(بەڵێنی هاوسەرێتیو فاتیحە خوێندن و خوازبێنی، بەگرێبەندی هاوسەرێتی دانانرێن ) بەڵام پاشگەزبوونەوەكە لە خوازبێنی وا دەخوازێ كە ئاكامەكانی ئەوپاشگەزبوونەوە دیاربكەین.

لەدوو خاڵدا باس لەو ئاكامانە دەكەین كە بریتین لەحوكمی مارەییو خەڵاتەكان.
ئەگەر خواز بێنییەكە جێبەجێ بێت یەكێك لە دەستگیرانەكان چ خوازراو بێ یان خوازیار دیاری پێشكەشی ئەوی تردەكات ، هەروەها خوازیار هەڵدەستێ بە پێشكەش كردنی هەموو یان هەندێ لەمارەییەكە بۆ دەستگیرانەكەی.
بەڵام كاتێك یەكێكیان پەشیمان دەبێتەوە دەبێ حوكمی چی بێت. لەخوارەوە لەدوو خاڵدا باسیان لێ دەكەین :

## ب- حوكمی مارەیی

ئەگەر هاتوو خوازیار پێش بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتی ئەو مارەییەی كەلەسەری ڕێك كەوتوونە دایە دستگیرانەكەی، دوایی لەهاوسەرێتییەكەیان پاش گەز بووەوە خوازبێنییەكە نەما خوازیار بۆی هەیە وەری بگرێتەوە، ئەگەر مارەییەكە هاوچەشن (مثلي) بوو هاو چەشنەكەی وەر دەگرێتەوە، وەئەگەر هاو

چەشن نەبوو هەمان مارەیی وەردەگرێتەوە ئەگەر مابێ. بەڵام ئەگەر مارەییەکە نەمابێ واتە لەناو چووبێ لەوحاڵەتەدا بەهاکەی وەر دەگرێتەوە.

دەتوانین بڵێین ئەوحوکمە لەگەڵ دادپەروەریدا دەگونجێ چونکە ئەو مارەییە لەسەر بنچینەی ئەنجامدانی گرێبەندی هاوسەرێتی دراوەتە دەستگیرانەکە، وەلەبەر ئەوەی هاوسەرێتی یەکە ئەنجام نەدرا جا لەبەر هەرهۆیەك بێت بۆیە خوازیار بۆی هەیە وەریبگرێتەوە چونکە ئەو مارەییە لەلایەن خوازیارەوە بەدەستگیرانەکەی نەبەخشراوە بەڵکو لەسەر بنچینەی بەرامبەرکێ (معاوضة) پێی دراوە واتە مارەییەکە بەمەبەستێکی دیاریکراو پێی دراوەو ئەو مەبەستەش نەهاتۆتە دی کەهاوسەرێتی یە بۆیە وادەخوازێ بدرێتەوە[1] .

شایەنی باسە ، داد پەروەری وادەخوازێ کە ئێمە جیاوازی بکەین لەنێوان پەشیمان بونەوەی خوازیار یان خوازراو دەستگیران چونکە ئەگەر هاتوو خوازیار پەشیمان بۆوە ستەمە خوازراو ناچار کەین مارەییەکە یان بەهاکەی بۆ خوازیار بگەڕێنێتەوە چونکە بەزۆری دستگیران دوای بەدەستگیرانی بوونی دەست لەمارەییە کەی ئەداتو هەندێك کەلو پەلو جلوبەرگی پێدەکڕێ، بۆیە ئەگەر لەکاتی پەشیمان بوونەوەی ناچاری بکەین بەگەڕاندنەوەی مارەییەکە یان بەهاکەی ئەمە وادەگەیەنێ کەئێمە ناچارمان کردووە ئەو زیانەی لەئاکامی کڕینی ئەو کەلو پەلو جلوبەرگانە لێی دەکەوێ بیخاتە ئەستۆی خۆی.

ئێمەش ئەم ڕایە پەسند دەکەین، چونکە خوازراو بە پاشگەزبوونەوەی خوازیار، لە لایەنی کۆمەڵایەتیەوە دەشکێو لەوانەیە ناوبانگی بزڕێ، کەوابوو بە

[1] - د . عبد الرض الصابونی : شرح قانون الاحوال الشخصیة ،سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤ .

هەڵوەشاندنەوەی خوازبێنیەکە زەرەرمەند دەبێت، بۆیە واباشە ئەو زیانە ببژێردرێ، ئەگەر خوازیار پاساوێکی ڕەوای نەبێت بۆ پاشگەزبوونەوەکەی.

سەبارەت بەمە، دادگای مسری لەسەر ئەمانەی خوارەوە سەقامگیر بووە:

١–خوازبێنی گرێبەندێکی سەپاوە نیە .

٢– بەتەنها پەشیمان بوونەوە لە خواز بێنی نابێتە هۆیەك لە هۆیەکانی قەرە بوو.

٣- ئەگەر لەئاکامی پەشیمان بونەوە لەخوازبێنی زیانێك بە یەکێك لە دستگیرانەکان کەوت دەبێ حوکمی قەرە بوو لەسەر بنچینەی بەرپرسیارێتی کەم تەرخەمی ( المسؤولية التقصيرية ) دەربکرێ[1] .

هەروەها لەیاسای باری کەسیی عیراقیدا لەبڕگەی دووی مادده نۆزدەدا هاتووە : (( ئەگەر خزاز بێن برێك پارە یان ( شت و مەك ) پێش بەستنی گرێبەندەکە بەناوی مارەییەوە بەدەستگیرانەکەی دا ، دوایی لایەنێکی گرێبەندەکە پەشیمان بووەوە یان مرد ، دەکرێ ئەم شت و مەکە بگەڕێنێتەوەو ئەگەر شت و مەکە کەش لەناو چوبێت لەجیاتیەکەی وەردەگیرێت ))

## ج- حوکمی دیارییەکان

ئەگەر هاتوو خوازیار هەندێك دیاری پێشکەش بە دەستگیرانەکەی کرد یا بەپێچەوانەوە؟ دوایی خوازبێنیەکە هەڵوەشایەوە ئەبێ چارە نووسی ئەو دیاریە چی بێت؟

---

[1] -د . عبد الرزاق النسنهوری : الوسيط، ج/١ ، ل٨٣٠

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەتوانین بگەڕێینەوە بۆ بڕگەی سێ لەماددەی نۆزدەدا کە دەڵێ:(حوکمەکانی بەخشین (هبة) لەسەر دیاریەکان پەیڕەو دەکرێ)[1] .

## دووەم: هاوسەرێتی و ئاکامەکانی

هاوسەرێتی گرێبەندێکە لەنێوان ژنێك و پیاوێك، کەبەپێی شەرع ئافرەتەکە بۆی دەشێ و حەلاڵە بیخوازی[2]، بە مەبەستی دامەزراندنی پەیوەندییێك بۆ بەیەکەوە ژیان و بوونی وەچە[3] .

کەواتە بەو ڕێککەوتنە دەوترێ گرێبەندی هاوسەرێتی کەلەنێوان خوازیارو خوازراودا یان بەهۆی جێگرەکانیانەوە وەك بریکارو لێپرسراو (الوكيل و الولي) دەبەسترێ بەمەرجێك ڕەزامەندی لایەنەکانی لەگەڵدابێ. ئەگەر گرێبەندەکە بەم شێوەیەی سەرەوە بەسترا ئەوا هەردوو هاوسەر بۆیان هەیە بەشێوەیەکی ڕەوا چێژ لەیەکتر ببینن.

گرێبەندی هاوسەرێتی دەبێ هەندێك ڕایەڵ و مەرجی تێدابێ تاوەکو گرێبەندەکە ڕەوابێ، بۆیە لەخوارەوە لەچوار خاڵدا باسیان دەکەین بەم شێوەیەی خوارەوە :

---

[1] - ئەو حوکامانەی لەماددە /٦٢٠ تاکو ٦٢٥ی یاسای شارستانی عیراقی ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١ ڕوونکراوەتەوە . بەپێی ئەو حوکمانەش بەخشەر ( واهب ) بۆی هەیە لەچەند حالەتێکدا پاش گەز بێتەوە کە لە دوتۆی ئەو ماددانەدا ئاماژەی پێ کراوە.

[2] - ئەم دەستەواژەیە لە کتێبەکانی یاسازانی ئیسلامیەوە وەرگیراوە، کە خۆی مانا پێچەوانەکەشی تیایە، واتە پیاوەکەش دەبێ بۆ ژنەکە شیاو بێت بەپێی شەرع، چونکە شیاوی یەکێکیان بۆ ئەوەی تریان بە جۆرێکی ئۆتۆماتیکی شیاوی هەردووکیان بۆیەکتر دەگەیەنێ.

[3] -بڕگەی یەك لەماددە سێی یاسای باری کەسیی عێراقی ژمارە ١٨٨ی ساڵی ١٩٥٩ هەموارکراو .

## ڕایەڵەکانی گرێبەندی هاوسەرێتی

لەشەرعدا بەوشتە دەوترێ ڕایەڵ کەشتەکەی لەسەر دەوەستێ و بەشێکە لێی وەك خوێندنەوەو ڕاوەستان و چەمانەوەو سوجدەبردن و دانیشتن لەنوێژدا[1].

بەم پێیە گرێبەندی هاوسەرێتی تەنها دوو ڕایەڵی هەیە، یەکێکیان ئیجابەو ئەوی تریشیان قبوڵە.

لەم بارەیەوە لەدەقی مادده چواری یاسای باری کەسێی عێراقیدا هاتووە : ((گرێبەندی هاوسەرێتی بەدەرخستنی ئیجاب بە قسە یا بە عورف لە لایەنێکی گرێبەندەکەو قبوڵکردنییێتی لەلایەنەکەی ترەوە یا لەلایەن بریکارەکەیەوە دەبەسترێت )) .

ئیجاب بەحاڵەتە دەوترێ کەلە لایەنی یەکەمەوە دەردەچێ جاچ پیاوەکە بێت یان ژنەکە وەك نیشانەیەك بۆئاراستە بوونی ویستی (ارادتە) بۆ بەستنی گرێبەندەکە .

قبوڵیش بەرەزامەندی لایەنی دووەم دەوترێ کە گوزارشت لە ئاراستە بوونی ویستی بۆ قبوولکردنی ئەوەی لایەنی یەکەم بەدەری خستبوو، دەکات.
چۆن دەبێ ئیجابەکە هەروەها قبوڵەکە لەلایەن ڕێککەوتووە کانەوە دەربچێ وەهاش دەکرێ لەلایەن بریکار یان جێگرە کانیانەوە دەربچێ .

لەگرێبەندا گریمانەی بوونی دوولایەن دەکرێ کەڕازی بوونە بەبەستنی گرێبەندەکە.

---

[1] - نظام الدين عبدالحميد : احكام الاسرة فی الفقه الاسلامی ، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧ .

بۆڕەزامەندیش گریمانەی هەبوونی ویست (الارادة) دەکەین ، بۆیە ئەو کەسەی کەویستی نیە ( معدوم الارادة ) وەك شێت یان منالّی نەفام و یان بێ هۆش بەهۆی سەرخۆشی یان نەخۆشی شیاوەنین بۆ ئەوەی ڕەزامەندییان دەربڕن[1] . لەبەر نەبونی لێهاتوویی شایستەیی ( اهلية ) بەپێی یاسا .

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ڕێککەوتووەکان دەتوانن بەڕاشکاوەیی یان ناڕاشکاوەیی گوزارشت (تعبیر) لەویستیان بکەن. دەکرێ گوزارشتەکە ڕاشکاوەبێت بە قسە یان بەنووسین بێت هەروەها دەشکرێ بە ئاماژە بۆکردن بێت.

بۆ نموونە، ئەگەر هاتوو پیاوێك بەئافرەتێکی شیاوی ووت تۆم کردە هاوسەری خۆم بەمارەیی پێشینەی هێندە دینارەو پاشینەی هێندە مسقالّ زێڕ، ئافرەتەکەش ووتی قبوولّمە . یان ئافرەتێك ووتی خۆم کردە هاوسەرت بە مارەییەك بڕەکەی هێندەیە و پیاوەکەش ووتی قبوولّمە . گرێبەندەکە لەنێوانیان دەبەسترێ و ئاکامەکانیشی لەسەر درووست دەبێ . گوزارشتی ناڕاشکاویش بریتیە لە هەلّوێستێك یان کردەوەیەکی ماددی یان یاسایی کە واتای ئیجاب یا قبولّ ببەخشێ .

دوایی ئەوەی باسی هەردوو جۆری گوزارشتی ڕاشکاوەییو نا ڕاشکاوییمان کرد، پرسیارێك سەر هەلّدەدات ئەویش ئەوەیە حوکمی بێ دەنگی چییە ؟

بۆ وەلاّمی ئەم پرسیارە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ دوو بنچینە[2] :

---

[1] - فرید فتیان : شرح قانون الاحوال الشخصية ، ط/٢، داروسط، لندن، ٩٨٦ ، ل٤٥ .

[2] - لەبڕگەی (١)ی مادده /٨١ی یاسای شارستانی عێراقی ژمارە ٤٠ی سالّی ١٩٥١ هاتووە : (( ١- هیچ وتەیەك ناخسترێتە پالّ بێدەنگەوە بەلاّم بێدەنگی لەکاتی پێویستیدا نیشانەیە بەقبوول دادەندرێ )).

**بنچینەی یەکەم** : ناتوانین بڵێین کەسی بێدەنگ گوزارشتی لە شتێك کردووە.

**بنچینەی دووەم** : بێدەنگی لەکاتی پێویستیدا گوزارشتی دەرخستەیە (ان السکوت فی معرض الحاجة بیان ) .

کەواتە ئەگەر پیاوێك گوزارشتی لە بەدەرخستنی خۆی کرد بۆ بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتی لەگەڵ ئافرەتێك، ئەگەر ئافرەتەکە بێدەنگ بوو ئەم بێدەنگییە بەقبووڵ دادەندرێ : هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕەچاو کردنی شەرمو ئابڕوی ئافرەتەکە ئەگەر کچ بێت، هەروەها ئەو نێوەندە کۆمەلایەتییەی تییایدا دەژێت هەروەها لەبەر ئەوەی بێدەنگییەکەی لەکاتی پێویستی دایە بەپێی دابونەریتی کۆمەڵ تائەم قۆناغەش کەئێمەی تیا دەژین ، بەلایەنی کەمەوە لەهەندێ ناوچەی گووندنشینی و عەشایەری ئەم دیاردەیە ماوە، بەڵام ئەوەی ڕەچاو دەکرێت سەرهەڵدانی گۆڕانکارییێکی بەرچاو لە ئاستی هوشیاری‌و هەستیاری ئافرەتانی کوردستان، کە زۆر درەنگە ئەو ڕۆژەی بێدەنگ بوونی ئافرەت بە قبوڵ دانەندرێت. ئەمە دەکرێ گرێبەندی هاوسەریەتی لەنێوان ئامادەنەبواندا ببەسترێ . بۆ نمونە ، پیاوێك لەشارێك یا لەشارۆچکە یەکەوە نامەیەك بۆ ئافرەتێکی تر لە شارێك یا لە شارۆچکەیەکی ترەوە بنێرێ و لە نامەکەیدا بڵێ تۆم کردووە بە هاوسەری خۆم بە بڕی مارەیی پێشەکی هێندە دینارەو پاشەکی هێندە مسقال زێڕ ، ئەگەر ئافرەتەکە لەبەردەم دوو شایەت نامەیەکی خوێندەوەو ووتی قبووڵمە ئەوا گرێبەندەکە دەبەسترێ .

یاسای باری کەسیی عیراقی لەبڕگەی دووی ماددەی شەشدا چارەسەری ئەم مەسەلەیەی کردووەو ڕێگای داوە ئامادە نەبووێك بە نامە گوزارشت لە خواستی بکات و ئاگاداری لایەنەکەی تر بکاتەوە ئەمەش دەقەکەیەتی:(گرێبەندی

هاوسەرێتی بە نووسراوێك لەلایەن نائامادەوە (غائب) دەبەسترێت بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بیخوازێت بەمەرجێك نووسراوەکە لەبەردەم دوو شایەت بخوێندرێتەوە ، ئەوانیش ناوەڕۆکەکەی ببیستن و شایەتی لەسەر ڕەزامەندی کچەکە لەسەر گرێبەندەکە بدەن).

لێرەدا دەتوانین بڵێین ئەگەرچی ماددەی ناوبراو ئاماژەی تەنها بۆ (ئیجاب)ی پیاو قبوڵی ئافرەت کردووە بەڵام ئەوە ئەو مانایە ناگەیەنێ کەنابێت ئیجاب لە ئافرەتەکەوە بێت، ڕاستەبەپێی زۆربەی حاڵەتەکان و لەبەر شەرمو ئابڕوی ئافرەت خەڵك واڕاهاتووە کە ئیجاب لە پیاوەوە بێت. بەڵام هیچ کۆسپێکی یاسایی ڕێ لە پێچەوانەی ئەمە ناگرێت.

گرێبەندی هاوسەرێتی وەکو هەموو گرێبەندێك پێویستە مەرجەکانی بەستن(انعقاد)، و مەرجەکانی دروستی (صحة)، و مەرجەکانی بەرکاربوون (نفاذ)، و مەرجەکانی سەپاوێتی ( لزوم )ی تیابێت لەبەر گرنگێتی ئەم جۆرە گرێبەندەو پەیوەندیی بە خێزان و کۆمەڵەوە بۆیە هەندێك لە حوکمەکانی جیاوازیان هەیە لە حوکمەکانی جۆرەکانی تری گرێبەند .

## لەخوارەوە لە چەند خاڵێکدا باس لەو مەرجانە دەکەین:

### أ- مەرجەکانی بەستن

مەرجەکانی بەستن ئەو مەرجانەن کەدەبێ لەڕایەڵەکانی گرێبەندەکە هەبێ بەچەشنێك نەبوونی مەرجێك لەو مەرجانە دەبێتە هۆی پووچەڵ کردنەوەی گرێبەندەکەو وەکو نەبووی لێ دەکات و هیچ ئاکامێکیشی نابێت و پێی دەووترێ گرێبەندی پووچەڵ .

ئەو مەرجانە دابەش دەکرێن بۆ سێ کۆمەڵە ، کۆمەڵەی یەکەم پەیوەندیان بە ڕێککەوتووەکانەوە هەیە،و کۆمەڵەی دووەمیش پەیوەندیان بەناوەڕۆکی گرێبەندەکەوە هەیە،و کۆمەڵەی سێیەمیش پەیوەندیان بە شێوازی گرێبەندەکەوە هەیە[1].

**یەکەم : ئەو مەرجانەی پەیوەندییان بە ڕێککەوتووەکانەوە هەیە**

أ – پێویستە هەریەکێك لە ڕێککەوتووەکان لێهاتووبێ بۆ بەڵێنکاری(تعاقد).

وە ئەم لێهاتنەش دوو جۆرە، لێهاتنی هاوسەرێتی تەواو، و لێهاتنی هاوسەرێتیی ناتەواو .

---

[1] - لەمادده پێنج ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا دوو جۆرە مەرج هاتووە ، یەکەمیان مەرجە شەرعییە کان ، دووەمیان مەرجە یاسایی یەکان . تیایدا هاتووە : (( لێهاتن لە گرێبەندی هاوسەرێتی دێتەدی ، بە لەئارادابوونی مەرجە یاسایی و شەرعیەکانی هەردوو لایەنی گرێبەندەکە یان ئەوانەی لەجیاتی ئەوان بەم کارە هەڵدەستن )) .

هەروەها مادده شەش مەرجە شەرعیەکانی دیاری کردووەو تیایدا هاتووە : (( ١- گرێبەندی هاوسەرێتی نابەسترێت ئەگەر مەرجێك لە مەرجەکانی بەستن یان دروستی لە دەست بدات ، مەرجە کانیش لە خوارەوە دەستنیشان کراون :

أ-یەکدیگرتنەوەی دانیشتنی ئیجاب و قبووڵ .

ب- هەردوو لایەنی گرێبەندەکە گوێیان لەقسەی یەکتربێت و لەیەك تێ بگەن کە مەبەستەکە بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتیە .

ج- کۆك بۆنی ئیجاب و قبووڵ .

د- شایەتیدانی دوو شایەتی لێهاتوو لەسەر گرێدانی هاوسەرێتیەکە .

هـ- پێویستە گرێبەندەکە پابەندی مەرجێك یا ڕوداوێکی بەئاکام نەگەیشتوو نەبێت .

٢- گرێبەندی هاوسەرێتی بەنووسراوێك لەلایەن نا ئامادەوە دەبەشرێ بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ بیخوازێت بەمەرجێك نووسراوەکە لەبەر دەم دوو شایەت بخوێدرێتەوە ، ئەوانیش ناوەڕۆکەکەی ببیستن و شایەتی لەسەر ڕەزامەندی کچەکە گرێبەندەکە بدەن)) .

لێهاتنی هاوسەرێتیی تەواو بەهۆش و تەواو کردنی تەمەنی هەژدەساڵی دێتەدی، هەروەکو لەدەقی مادده حەوتی یاسای باری کەسی ژمارە ۱۸۸ ی ساڵی ۱۹۵۹ هەموار کراودا هاتووە :

( ۱- مەرجی تەواوی لێهاتوویی هاوسەرێتی ، هۆش و تەمەنی هەژدە ساڵیە ..).

لێهاتنی هاوسەرێتیی ناتەواو ، ئەم لێهاتنە بۆ ئەو کەسانە دێتە دی کەنەخۆشی ئەقڵییان هەیە ، لەم ڕووەوە لەبڕگەی دووی مادده حەوتی یاسای باری کەسیی عیراقیدا هاتووە: (( دادوەر بۆی هەیە ڕێگە بە مارەبڕینی هەریەك لەهاوسەرەکان بدات ئەگەر نەخۆشی ئەقڵی هەبێت و بەڕاپۆرتێکی پزیشکی سەلمێندرا کە هاوسەرێتییەکەی زیان بەکۆمەڵ ناگەیەنێت و لەبەرژەوەندی کەسێتی لایەنە نەخۆشەکەیە ، بەمەرجێك لایەنەکەی دیکە بەڕوون و ئاشکرایی ڕەزامەندی پێشان بدات)).

هەروەها ئەم لێهاتنە بۆ ئەو کەسانە دێتەدی کەتەمەنی پانزە ساڵیان تەواو کردووە بەپێی مادده هەشتی یاسای باری کەسیی عێراقی کەدەڵێ:

(( ۱- ئەگەر کەسێك تەمەنی پانزە ساڵی تەواو کرد و داوای بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتی کرد، دادگا بۆی هەیە ڕێگای پێبدات، ئەگەر بۆی سەلمێندرا لێهاتوویی هاوسەرێتی و توانای جەستەیی هەیە و دوای ڕەزامەندی **سەرپەرشتیارە** شەرعیەکەی. ئەگەر سەرپەرشتیارەکەی ڕازی نەبوو، دادوەر لەماوەیەکی دیاریکراو داوای ڕەزامەندی لێدەکات، ئەگەر لاری نەبوو یان هۆی لارییبوونەکەی شایانی ڕەچاو کردن نەبوو دادوەر ڕێ بەهاوسەرێتی یەکە دەدات.

٢- ئەگەر ئەو پەڕی پێویستی لەئارادابێت ، دادوەر بۆی هەیە ڕێپێدانی هاوسەرێتی ئەو کەسەی کەپێی ناوەتە پانزە ساڵیەوە ، مەرجیشە بۆئەم ڕێپێدانە بالق بوونی شەرعی و توانای جەستەیی هەبێت )) .

ب – ئەبێ هەردوو لایەنەکە پێك بشێن .

دوو جۆرە پێکنەشیان هەیە، پێکنە شیانی هەمیشەیی و پێکنەشیانی کاتی. پێکنەشیانی هەمیشەیی بەهۆی خزمایەتی و شیردانەوەیە بەلام پێکنە شیانی کاتی بەهۆی ڕاگرتنی زیاتر لەچوار ژن بەجارێك و بێ دینی و تەلاقدانی سێ بەسێ و بوونی مافی کەسانی تر بەگرێبەندی هاوسەرێتی و عیددەو هەستانی یەکێك لە پێکنەشاوەکان لەکاتی هاوسەرێتیدا بەڕێکەوتنی هاوسەری لەگەڵ پێکنەشیاوەکەی تردا دەگرێتەوە هەر وەکو دوواتر بەدرێژی دێینە سەریان.

ج – گوێ بیستبوونی هەریەکێك لە ڕککەوتووەکان لەقسە کانی ڕێککەوتووە کەی تردا لەگەڵ تێگەیشتن کەمەبەست لە گرێبەندەکە بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتییە.

**دووەم : ئەو مەرجانەی پەیوەندیان بە ناوەڕۆك (محل) ی گرێبەندەکە هەیە**

بەپێی بیرو ڕای زۆربەی یاسازانان ئافرەت ناوەڕۆکی گرێبەندی هاوسەرێتییە[1] و دەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوەی تیابێ :

ا – دەبێ ئافرەتەکەو پیاوەکە هەردووکیان بەیەك بشێن . واتە ئەگەر لە پێکنە شیاوەکان بوون جاچی پێکنەشیاوی هەمیشەیی بن وەیا کاتی و گرێبەندی هاوسەرێتی یان بەست لەو حاڵەتەدا گرێبەندەکە پووچەڵ دەبێ وەك مێرد کردنی موسڵمانێك بە نا موسڵمانێك .

[1] - د . عبد الرحمن الصابوني : شرح قانون الاحوال الشخصية ، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥.

ب – دەبێ مێینی (انوثـة) ی مسۆگەر بێت بەپێچەوانەی ئەوە ناکرێ ببێتە ناوەڕۆکی گرێبەندی هاوسەرێتی بۆ نموونە وەك نێرەمووك کەناکرێ بە پیاو یان بە ژن دابندرێ لەکاتێکدا ئەگەر سیفاتەکانی پیاوێتی و ژنێتی وەکویەك تیابێت و نەکێ نە بەپیاو وەنە بەژن دایبنێیت لەو حاڵەتەدا مارە کردنی بەپووچەڵ دادەندرێ[1].

**سێیەم: ئەو مەرجانەی پەیوەندیان بە شێوازی گرێبەندەکەوە هەیە**

أ– دەبێ ئیجابو قبووڵەکە لە یەك دانیشتندا بێتەدی. واتە دوای ئیجابی خاوەن ئیجابەکە، شتێکی تر لە خاوەن قبووڵەکەوە دەرنەچێت، تانووت لێدان بێت لە گرێبەستەکە. بۆ نموونە، یەکێکیان لەو دانیشتنەدا بچێتە دەرەوە یان قسەیەکی وەها بکات پەیوەندی بە گرێبەندەکەوە نەبێت، جا لەو حاڵەتەدا، ئەگەر قبووڵەکەش دەربچێ، گرێبەندەکە نابەسترێ.

ب– دەبێ قبووڵەکە کۆك بێت لەگەڵ ئیجابەکە، واتە ویستو ئارەزووی هەردوولا بۆ مۆرکردنی گرێبەندەکە بچێو هیچ جیاوازییەك لە نێوان قسەکانیاندا نەبێت. بۆ نموونە، ئەگەر پیاوێك بە ئافرەتێك بڵێ تۆم کردە هاوسەری خۆم، بە مارەیی هەشت هەزار دیناری پێشینەو نۆزدە مسقاڵ زێڕی پاشینەو ئافرەتەکەش بڵێ قەبوولم کرد، ئەمە نیشانەی بەیەك گەیشتنی ویستو ئارەزووی هەردووکیانە بە شێوەیەکی تەواوو دەبێتە هۆی بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتییەکە.

[1] - نظام الدين عبد الحميد : احكام الاسرة فى الفقه الاسلامى ، سەرچاوەی پێشوو، ل٤١

ج- نابێ نیشانەی بەستنەوەی گرێبەندی هاوسەرێتییەکە بە بەدیهاتنی ڕووداوێك لە داهاتوودا لە دەربڕین (صيغة) ی گرێبەندەکە هەبێت یان ئەوە بگەیەنێت کە لە داهاتوودا ببەسترێ. بۆ نموونە، پیاوێك بە ئافرەتێك بڵێ ئەگەر لە پێشبڕکێیەکە بردتەوە، دەتهێنمو ئافرەتەکەش قەبووڵی بکات، جا لێرەدا گرنگ نیەهاتنەدی مەرجەکە مسۆگەر بێت یان نا، وەك پیاوێك بە ئافرەتێك بڵێ هاوینی داهاتوو دەتهێنم. لەو حاڵەتانەی سەرەوەدا گرێبەندەکە نابەسترێ.

د- پەشیمانبوونەوەی خاوەن ئیجاب لە ئیجابەکەی بەر لە قەبووڵکردن ئەگەرهاتوو خاوەن ئیجابەکە بەر لە قەبووڵکردن لە ئیجابەکەی پەشیمان بۆوە، پەشیمانبوونەوەکەی بە ڕاست دادەندرێتو ئیجابەکەش پووچەڵ دەبێتو ئەگەر لایەنەکەی تر دوای ئەوەی قەبووڵی کرد ئەوکاتە قەبووڵەکەی بە ئیجابێکی نوێ دادەندرێتو پێویستی بە قەبووڵکردنی خاوەن ئیجاب دەبێ پێش هەموو شتێ. هەروەها هەمان حوکمی دەبێ ئەگەر خاوەن ئیجابەکە بەر لە دەرچوونی قەبووڵەکە لێهاتنەکەی لەدەست دا، بۆ نموونە، ئەگەر لە کتوپڕدا شێت بێت.

## ب- مەرجەکانی دروستی ( شروط الصحة )

مەرجەکانی دروستی ئەو مەرجانەن کە دەبێ لە گرێبەندەکەدا هەبن تاکو ئاکامە شەرعیەکانی لێ بکەوێتەوە، وە بە نەبوونی مەرجێك لەو مەرجانە گرێبەندەکە نادروست دەبێ.

کەواتە مەرجەکانی دروستی ئەو مەرجانەن کە لە دەرەوەی ڕایەڵەکاندانە، بەڵام دەبێ لە گرێبەندەکەدا هەبن تاکو ئاکامە شەرعیەکانی لێ بکەوێتەوە، وە ئەگەر مەرجێك لەو مەرجانە نەبێ گرێبەندەکە نادروست دەبێ، ئەم مەرجانەش ئەمانەی خوارەوەن:

**یەكەم: نابێ ئافرەتەكە نەشیاو بێ بۆ ئەوكەسەی داوای دەستی كردووە**

لە ماددە دوانزەی یاسای باری كەسیی عێراقیدا هاتووە: (( پێویستە بۆ دروستی هاوسەرێتی، ژنەكە، بۆ ئەوكەسەی كە دەیهێنێت، نەشیاوی شەرعی نەبێت )).

بۆ نموونە، نابێ ئافرەتێك مێرد بە پیاوێك بكات كە خوشكی باوكی یان خوشكی دایكی ئەوی لەلایە، یان مێردكردنی خوشكی باوك بەسەر كچی براكەی هەروەها خوشكی دایك بەسەر كچی كچی خوشكی. هەروەها نابێ ژنێكی تەڵاقدراو بهێندرێ ئەگەر تەڵاقەكەی گەورە بێ تاكو ماوەی عیددەی بەسەر نەچێ. جا لەبەرئەوەی یاسازانان لەبارەی نەشیانی ئەم ئافرەتانە بیروڕایان یەك نیە بۆیە بەستنی گرێبەند بۆ هاوسەرێتی كردنی یەكێك لەو ئافرەتانە دەبێتە هۆی لەدەستدانی مەرجێك لە مەرجەكانی دروستی.

**دووەم: بوونی شایەت لەسەر بەستنی كرێبەندەكە**

یاسای باری كەسیی عێراقی لە ماددەی شەشدا هەندێ مەرجی بەستنو دروستی بۆ بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتی داناوە، یەكێك لەو مەرجانە كە لە بڕگەی (د)دا هاتووە، مەرجی بوونی شایەتە بۆ بەستنی گرێبەندەكەو لەم بارەیەوە دەڵێ: (( گرێبەندی هاوسەرێتی نابەسترێ ئەگەر مەرجێك لە مەرجەكانی بەستن یا دروستی لەدەست بدات، مەرجەكانیش لە خوارەوە دەسنیشان كراون: .......... د- شایەتیدانی دوو شایەتی لێهاتوو بۆ بەستنی گرێبەندی هاوسەرێتیەكە )).

هەروەها پێغەمبەر (د.خ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (( لانكاح الا بولي وشاهدي عدل )) واتە بەبێ ئامادەبوونی دوو شایەت‌و سەرپەرشتیار هاوسەرێتی نابێ.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە گرێبەندی هاوسەرێتی وەك زۆربەی گرێبەندەکان بۆ بەستن‌و ڕاگەیاندنی لەنێو خەڵکدا پێویستی بە شایەتی هەیە. ڕەنگە هۆی ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ پیرۆزیی پەیوەندی هاوسەرێتی‌و ڕێگاگرتن لەبەردەم گومانی خراپ پەیداکردن‌و جیاوازیکردن لە نێوان پەیوەندیی جووتبوونی حەڵاڵ‌و حەرام دا، ئەمەو گەلێك هۆی تریش.

بیروڕای یاسازانان لەبارەی حوکمی شایەتیدا لێك جیاوازە. ئەتوانین ئەو بیروڕایانە بکەین بە چوار کۆمەڵە، کۆمەڵەی یەکەم، کە زۆربەی یاسازانەکان دەگرێتەوە، وای بۆدەچن کە دەبێ لەکاتی بەستنی گرێبەستەکەدا شایەت هەبێ، وە بە نەبوونی دەبێتە هۆی نادروستی گرێبەستەکە[1] .

ئەم کۆمەڵەیە فەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) دەکەنە بەڵگەی قسەکانیان کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێی کردووە. کۆمەڵەی دووەم وای بۆدەچن کە بۆ بەستنی گرێبەستی هاوسەرێتی هیچ پێویست بە ئامادەبوونی شایەت ناکات، ئەوانە ئایەتی/٣ لە سوورەتی النساء لە قورئانی پیرۆز دەکەنە بەڵگە بۆ قسەکانیان، کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ((فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ)) واتە: ((جا ئافرەتانی تر کە خۆشتان لێیان دێ‌و پێتان خۆشیك‌و پاکن، دووان یان سیان یا چوار ژن بۆ خۆتان مارە ببڕن)). وە ئەوانە وای بۆدەچن کە ئەوەی لە سووننەدا هاتووە ناتوانێ ئەو حوکمەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە سنووردار بکات چونکە بە

[1] - بڕوانە نظام الدين عبد الحميد: احكام الاسرة في الفقه الاسلامي، سەرچاوەی پێشوو ل٤٦.

شێوەیەکی ڕەها هاتووە، وە هەروەکو دەشزانین هەموو حوکمێکی ڕەها بە ڕەهایی کاری پێ دەکرێت تا ئەو کاتەی حوکمێکی تر کە هەمان هێزی هەبێت یانیش لەو بەهێزتربێت سنووورداری بکات[1].

هەروەها ئیمام مالك وای بۆدەچێ کە جاڕدانی گرێبەستی هاوسەرگیری بەر لە جووتبوون بەسە بۆ دروستێتیی گرێبەستەکە، واتا پێویست بە ئامادەبوونی شایەت ناکات لەکاتی بەستنیدا[2]. هەروەها بیروڕای کۆمەڵەی چوارەم هی مالکییە، ئەم یاسازانانە دەڵێن پێویست ناکات گرێبەستی هاوسەرگیری لەکاتی بەستنیدا شایەتی لەگەڵدابێ، بەڵام دەبێ بەر لە جووتبوون هەبێ، وە بە پێچەوانەوە گرێبەستەکە پووچەڵ دەبێ[3].

بەڵام یاسای باری کەسیی عێراقی هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێی کرد ئەم ناکۆکییەی نەهێشت، یاسای ناوبراو وای دادەنێ گرێبەستی هاوسەرگیری نابەسترێ ئەگەر مەرجی بوونی دوو شایەتی لێهاتووی تیادا نەبێت.

بە ڕای زۆربەی یاسازانانی موسڵمان دەبێ شایەتەکان ئەم مەرجانەی خوارەوەیان تیا بێت:

١- دەبێ شایەتەکان لێهاتوویی یاساییان هەبێو خاوەن هۆش بن. واتە دەبێ تەمەنی هەژدەساڵیان تەواو کردبێتو لێهاتنەکەشیان دووچاری کۆسپێك لە کۆسپەکانی لێهاتن نەبووبێ، کە چوار کۆسپن بریتین لە شێتیو گێلیو موغەفەلو

---

[1] - لەویاسازانانە ابن ابي ليلي ، ابو نور ، ابن المنذر، عبد الرحمن بن مهدي بروانة نظام الدين عبد الحميد: سەرچاوەی پێشوو ل٤٦.

[2] - د.احمد علي واخرون: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل٣٤.

[3] - د.احمد علي واخرون: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل٣٤.

دەستبلاو (الجنون والعتە والغفلة والسفە) ئەم كۆسپانە وەكو تەمەن وایە لەڕووی پەیوەندیانەوە بە تەمیزی كەسێكەوەو كاریگەرێتی دەبێ لەسەر لێهاتنیەوە[1].

٢- دەبێ شایەتەكان هەردووك پیاو بن یان پیاوێكو ئافرەتێك بێت، هەروەكو خوای گەورە لە ئایەتی/٢٨٢ ی سورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ:

((وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى)).

واتە: ((دوو شایەت لەپیاوانی خۆتان (لە موسڵمانان بۆ ئەم كارە) جا ئەگەر دوو پیاو دەست نەكەوت، پیاوێكو دوو ژن كە ئێوە پێیان ڕازیبن، جا ئەگەر یەكێكیان لەبیری چوو، ئەوی تریان بیخاتەوە بیری)). دەبێ شایەتەكان لەیەك كاتدا قسەكانی هەردوو لایەنی گرێبەستەكەیان گوێ لێ بوو بێتو هەروەها لە واتای قسەكانیان تێگەیشتبن.

٣- ئەگەرهاتوو هاوسەرەكان موسڵمان بوون دەبێ شایەتەكانیش موسڵمان بن.

٤- دەبێ شایەتەكان دادپەروەر بن. مەبەست لێرەدا دادپەروەرییێكی بەرچاوە تا ئەو كاتەی پێچەوانەی ئەوە دەسەلمێندرێ. واتە نیشانەیەك لە ئارادا نەبێ كە ئەو شایەتانە نادادپەروەرن.

### سێیەم: دەبێ سەرپەرشتیار (ولي امر) گرێبەستەكەی بەستبێ

یاسازانانی موسڵمان لەبارەی مەرجی ڕەزامەندی سەرپەرشتیاری ئافرەتەكە هاوڕانین. كۆمەڵەی یاسازانان (جمهور الفقهاء) لەوانە مالیكیو شافعیو

---

١- ١ - بڕوانە د.عبدالمجید الحكیم واخرون: الوجیزفي نظریة الالتزام في القانون المدني العراقي، ج/١، منشورات جامعة بغداد، ١٩٨٦، ص٧١ ومابعدها.

حەنبەلیەکان وای بۆ دەچن، کە دەبێ سەرپەرشتیاری ئافرەتەکە ڕەزامەند بێت لەسەر بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە هەرچەندە ئافرەتەکە ئاقڵ و بالغیش بێت، وە بەپێچەوانەوە ئەگەر ئافرەتەکە خۆی یان بریکارەکەی پێی هەستا ئەوا گرێبەستەکە نادروست دەبێت.

بەڵام هەندێك لە یاسازانانی موسڵمان لەوانە حەنەفی و جەعفەرییەکان وای بۆدەچن ئەگەر ئافرەتەکە ئاقڵ و بالغ بێت پێویست بە ڕەزامەندی سەرپەرشتیارەکەی ناکات.

یاسای باری کەسیی عێراقی لە مادده/٤ دا بەپێی بیروڕای کۆمەڵەی دووەمی کردووەو مەرجی ئامادەبوون و ڕەزامەندی سەرپەرشتیاری ئافرەتەکەی دانەناوە. بەڵام ئەو هاوسەرەی هەژدەساڵانی تەواو نەکردبێ بەپێی حوکمی مادده/٨ی یاسای باری کەسیی عێراقی دەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوەی تیابێ[١]:

١- دەبێ کەسەکە چ کوڕەکە بێت یان کچەکە تەمەنی لە پانزە ساڵ کەمتر نەبێ.

٢- دەبێ داوای هاوسەرگیری بۆ دادگا بەرز کردێتەوە.

٣- دەبێ سەرپەرشتیارەکەی ڕەزامەند بێت.

---

[١] -دەقی مادده/٨ ی یاسای باری کەسیی عێراقی: (( ١- ئەگەر کەسێك تەمەنی پازدەساڵی تەواو کردو داوای بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیریی کرد، دادگا بۆی هەیە ڕێگەی پێ بدات، ئەگەر بۆی سەلمێندرا کە لێهاتوویی هاوسەری و توانای جەستەیی هەیەو دوای ڕەزامەندی سەرپەرشتیارە شەرعییەکەی. ئەگەر سەرپەرشتیارەکەی ڕازی نەبوو، دادوەر لە ماوەیەکی دیاریکراودا داوای ڕەزامەندی لێ دەکات، ئەگەر لاری نەبوو یان لاری بوونەکەی شایانی ڕەچاوکردن نەبوو دادوەر ڕێ بە هاوسەرگیریەکەدەدات.

٢- ئەگەر ئەوپەڕی پێویستی لە ئارادابێت، دادوەر بۆی هەیەڕێپێدانی هاوسەرگیری بداتە ئەو کەسەی کە پێی ناوەتە پازدە ساڵییەوە، مەرجیشە بۆ ئەو ڕێپێدانەی بالق بوونی شەرعی و توانای جەستەیی هەبێت)).

٤- دەبێ دادوەر ڕێگای پێ بدات، وە ئەگەر سەرپەرشتیارەکەی ڕەزامەند نەبوو، دادوەر بۆی هەیە دوای دڵنیابوون لە لێهاتوویی‌و توانا جەستەییەکەی ڕێگای پێ بدات.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ ڕێگاپێدانی دادوەر بۆ هاوسەرگیریی ئەو کەسەی تەمەنی پانزە ساڵی تەواو کردووەو هەژدە ساڵی تەواو نەکردووە مەرجێکی سەرەکییە بۆ بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیری، چونکە نەبوونی ئەم ڕێگاپێدانە، ڕێگا بە جیابوونەوە دەدات بەپێی برگەی/٣ لە ماددەی/٤٠ ی یاسای باری کەسیی عێراقی[١].

**چوارەم: نابێ گرێبەستەکە کاتی بێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو**

چونکە مەبەست لە پێکهێنانی خێزان بەشداری کردنە لە دامەزراندنی کۆمەڵ کە ئەویش لە ڕێگای منال بوون‌و پەروەردەکردنیەوە دەبێ بۆ بەردەوام بوونی ژیان. بۆیە هاوسەرگیریی کاتی‌و هاوسەرگیریی موتعە لەگەڵ ئەم مەبەستە ناکۆکن، هەر بۆیە بەپێی بیرورای یاسازانانی موسڵمان بێ لە هەندێك لە یاسازانانی جەعفەری هاوسەرگیری موتعە نادروستە.

هەروەها دادگاش لە عێراقدا ئەمجۆرە پەیوەندیانەی بە نادروست داناوەو هیچ ئاکامێکیشی لە ئاکامەکانی هاوسەرگیری دروست لێ ناکەوێتەوە.

[١] -دەقی ماددە/٤٠ ی یاسای باری کەسیی عێراقی: (( ژن‌و مێر بۆیان هەیە داوای لێك جیابوونەوە بکەن ئەگەر ئەگەر یەکێك لەم هۆکارانەی خوارەوە لە ئارادا بێت: ١- ........... ٢-......... ٣- ئەگەرهاتوو بەر لەوەی یەکێك لە هاوسەرەکان هەژدەساڵی تەواو کردبێت، گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە بەبێ ڕەزامەندی دادوەر ئەنجام درابێت)).

## ج- مەرجەکانی بەرکاربوون

مەرجەکانی بەرکاربوون ئەو مەرجانەن کە دوای بوونی مەرجەکانی تری بەستن‌و دروستی، ئاکامەکانی گرێبەستی هاوسەرگیری لەسەر دروست دەبێ، وە نەبوونی مەرجێك لەو مەرجانە پێویست بە ڕەزامەندی ئەو کەسە دەکات کە مافی ڕەزامەندیدانی بە دەستەوەیە.واتە گرێبەستەکە لەسەر لکانی بە ڕەزامەندییەکەوە دەوەستێ.

کەواتە دەتوانین بڵێین مەرجەکانی بەرکاربوون بە لێهاتوویی هەردوو هاوسەرەکان دێتەدی، وە ئەم لێهاتنەش بە بالقبوون‌و تەواوی ئەقڵ دێتەدی بەڵام ئەگەر یەکێك یان هەردوو هاوسەرەکان بچوکێکی ممیز بوون (لە سەرووی تەمەنی پانزە ساڵان‌و خوار هەژدە ساڵانەوە) یان لە حوکمی ئەودا بوون، گرێبەستەکە لە ڕووی شەرعیەوە لەسەر ڕەزامەندی سەرپەرشتیارەکەی دەوەستێ.

بەڵام لەڕووی یاساییەوە گرێبەستەکە بەرکار نابێ تاکو ئەو مەرجە یاساییانەی تیانەبێ کە لە مادده/٨ دا هاتووە.

## د- مەرجەکانی سەپاوێتی (شروط اللزوم)

مەرجەکانی سەپاوێتی ئەو مەرجانەن ئەگەر لە گرێبەستەکەدا هەبێ هیچ یەکێك لە هاوسەرەکان یان کەسانی تر بۆیان نیە داوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە بکەن هەروەها گشت ئاکامە شەرعییەکانی لەسەر دروست دەبێت. ئەو مەرجانەش ئەمانەی خوارەوەن:

## أ- وەك یەك بوون–هاوکوف (الكفاءة)

دەبێ ئەو پیاوەی دەیەوێ ببێتە هاوسەری ئافرەتێك وەکو ئەو بێت لە هەندێك ڕووی دیاریکراوەوە بەچەشنێك کە نەبێتە مایەی زیانگەیاندن بە ئافرەتەکە یان کەسوکاری ئافرەتەکە.

لە یاسای باری کەسیی عێراقیدا شتێکی وای تیانیە کە هەڵوێستی یاسادانەرمان لەبارەی مەرجی کەفائەوە بۆ دیار بکات[1].

دەبێ دادوەر سەبارەت بە کێشەکانی هاوکوفبوون بەپێی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام حوکم بدات، چونکە هیچ دەقێکی یاساییمان لەم بارەیەوە نیە بکرێ پیادەبکرێت.

هەروەها بۆ دیاریکردنی خاوەن ماف لە کەفائەتدا دەبێ جیاوازی بکەین لەنێوان دوو حاڵەتدا:

یەکەم، ئەگەر هاتوو هاوسەرگیریەکە لەسەر ڕەزامەندی دادوەر ڕانەوەستابێ. بۆ نموونە وەك حاڵەتی ئەوکەسەی تەمەنی پانزە ساڵی تەواو کردبێتو بیەوێ ببێتە هاوسەر، مافی کەفائەت بەتەنها مافی ئافرەتەکەیەو ئەو دەتوانێ بەکاری بهێنێ ئەگەر پێویست بوو. بەڵام لە حاڵەتەکەی تردا سەرپەرشتیارەکەش بۆی هەیە لەکاتی نەبوونی کەفائەتدا تانە لە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە بدات[2].

---

[1] - لە دەقی بڕگە دووی ماددە/١ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((ئەگەر دەقێکی دانراو بۆ پیادەکردن نەبوو، پێویستە پشت بە گونجاوترین بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام کە زیاتر لەگەڵ دەقەکانی ئەم یاسایە دەگونجێت ببەسترێت)).

[2] -بڕوانە دەقیماددە/٨ ی یاسای باری کەسیی عێراقی لەم بارەیەوە.

**ب–نابێ مارەییەکەی لە مارەیی هاوچەشن(مهر المثل) کەمتر بێت**

ئەگەرهاتوو ئافرەتێك لێهاتوویی هاوسەرگیری هەبێت، بە مارەییێکی کەمتر لە مارەیی هاوچەشنی خۆی، شووی کرد، ئەوکەسانەی سەرپەرشتیارن لەسەری بۆیان هەیە تانەی لێ بدەن و داوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە بکەن، مەگەر مارەییەکەی بۆ مارەیی هاوچەشن بەرز بکرێتەوە.

**ج– دەبێ سەرپەرشتیار (باوك یان باپیر) ناسراوبن بە ئەنجامدانی کار بەباشی**

ئەگەرهاتوو گرێبەستەکە بۆ هاوسەرگیریی کەملێهاتوویێك (ناقص الاهلیة) بێت، لەو حاڵەتە ئەگەر کەملێهاتووەکە گەورەبوو بۆی نیە داوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە بکات.

بە پێچەوانەشەوە، ئەگەرهاتوو سەرپەرشتیارەکە بە ئەنجامدانی کار بەشێوەیەکی خراپ ناسرابێت، ئەوا ئەو کەملێهاتووە دوای تەواوبوونی لێهاتنە یاساییەکەی بۆی هەیە داوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە بکات ئەگەر بەرژەوەندی ئەوی تیابوو[١].

**د– دەبێ گرێبەستەکە فرِوفێڵی تیانەبێ**

واتە نابێ پیاوەکە فرِوفێڵ لە ئافرەتەکە یان کەس وکاری بکات، بۆنموونە بڵێ من لە فلاَنە رِەچەڵەکم کەچی وانەبێ یان بە درۆ بڵێ فلاَنە برِوانامەم هەیەیان فلاَنە فەرمانەم هەیە یان بڵێ من ژنی ترم نیەو پێشتر ژنم نەهێناوە کەچی وانەبێ، وە لەبەر رِۆشنایی ئەو فرِو فێلاَنەی ئافرەتەکە مێردی پێ بکات، لەو حاڵەتەدا ئافرەتەکە خۆی و کەس وکاری بۆیان هەیە داوای هەڵوەشانەوەی گرێبەستەکە بکەن.

[١] -د.احمد علي والاخرون: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل٣٧.

بـەلاّم ئەگـەرهاتوو بـەکارهێنانی فرۆفیڵەکـە لەلایـەن ئافرەتەکـەوە بـوو ئەوکاتـە گرێبەستەکە سەپاوە دەبیّو پێویست بە هەڵوەشاندنەوە ناکات چونکە پیاوەکە مافی تەلاّقدانی بەدەستەوەیەو هەرکاتێك بیەویّ دەتوانیّ ئەم مافەی بەکاربهێنیّ[1].

بەکاربهێنیّ[1].

## هـ- تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری

تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری لە زۆربەی شەریعەتو یاسای گەلاندا مەرجێك نیە لە ڕاستیو دروستی گرێبەستی هاوسەرگیری، بـەڵکو لـە بنەڕەتـدا هـەر لـەو چرکە ساتەی کـە گرێبەسـتی هاوسـەرگیری تیـا بەشـێوەیەکی ڕاسـتو دروسـت دەبەستریّ، گشت ئاکامـەکانی لیّ دەکەوێتـەوە بـەبیّ ئـەوەی تۆمـار بکـریّ، بـەلاّم لەگـەلّ پێشـکەوتنی کۆمـەلّگاو لاوازبـوونی ڕۆڵـی ئـاینو زۆربـوونی کەیسـەکانی دەستلێکبەردانو تانەگرتن لە ڕاستیو دروستی گرێبەستی هاوسەرگیری، بۆیـە بـە پێویست زانرا کە هاوسەرگیری لە بەردەم کەسێکی ڕێگا پێدراو ئەنجام بـدریّ، کـە لە بنەڕەتدا دەبیّ دادوەر یان قازی شەرعی بێت.

جا لێرەدا بیرۆکەی ڕێگاپێدانی کەسێکی تر لەلایـەن دادوەر یـان قـازی شـەرعیەوە سەری هەڵدا بۆ بەستنو تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری.

بەم پێیە، دادگای باری کەسی پەڕاوێك دەداتـە ئـەو زانـا ئایینیـەی کـە لەلایـەن ئـەوە ڕێگـای پێـدراوە بـۆ بەسـتنو تۆمـارکردنی گرێبەسـتی هاوسـەرگیری، ئـەو پـەڕاوە ژمارەیـەك فـۆرمی گرێبەسـتی هاوسـەرگیری لـە دووتـۆی خۆیـدا دەگرێـت کـە هـەر هەموویان مۆری دادگایان بەسـەرەوەیەو دوای پڕکردنـەوەیان لەلایـەن زانـای ئـایینیو

[1] - بڕوانە نظام الدين عبد الحميد: سەرچاوەی پێشوو ل٦٢.

هەردوو هاوسەرەکەو شایەتەکان، وێنەیەکی دەگەڕێتەوە بۆ نووسینگەی سەرەکی تۆمارکردنی بەڵگەنامەکان کە بەپێی یاسا بۆ ئەم مەبەستە دادەمەزرێت.
شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یاسادانەری میسری هەر لە زووەوە کاری بەم سیستەمە کردووە بە مەبەستی کارئاسانی بۆ لایەنەکانی هاوسەرگیری‌و کەمکردنەوەی ئەرکی دادگای باری کەسی، بۆیە ئێمەش پێمان باشە یاسادانەری عیراقی‌و پەرلەمانی کوردستانیش هەمان ڕێچکەی یاسادانەری میسری لەمبارەیەوە بگرێتەبەرو ڕێگا بە چەند زانایەکی ئایینی‌و پارێزەران بدات بۆ ئەنجامدان‌و تۆمارکردنی گرێبەستی هاوسەرگیری، بەمەش کارئاسانییێك بۆ لایەنەکانی هاوسەرگیری دەکرێت‌و لە هەمان کاتیشدا ئەرکی سەرشانی دادگاکانی باری کەسی کەم دەکرێتەوە[1].

## ١- پێکنەشیاوەکان (المحارم)و خواستنی خاوەن کتابە ئاسمانیەکان

لەناو کۆمەڵگای سەرەتایی واباو بووە کە بە چاوێکی سووك بڕواننە ئافرەت‌و زیاتر بایەخ بە پیاو بدەن ئەویش لەبەر ئەوە بووە ئەوکاتە نێرینەکان زیاتر لە مێیینەکان توانی‌ویانە بەرگری لە خۆیان بکەن‌و بەرپەرچی ئەو هێرش‌و مەترسیانەش بدەنەوە کە لەلایەن دڕندە وەیان لەلایەن کۆمەڵانی ترەوە بەرەنگاری دەبوونەوە، هەروەها بۆ پەیداکردنی خۆراکیش پیاو لە ئافرەت بەتواناتر بووە هەربۆیە گەلانی کۆمەڵگای سەرەتایی بەمەبەستی ڕزگاربوون لە ڕەگەزی مێیینە هەڵدەستان بە کوشتنی ئەو ئافرەتانە تاکو نەبنە ئەرك بەسەریانەوە چی لەڕووی بەرگری لێ کردنیان وەیان لەڕووی دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیانیان، هەرئەمەش

[1] - بۆ درێژەی ئەم بابەتە بڕوانە المستشار حاتم صبحي الأرناؤوطي: موسوعة الأذونين الشرعيين والموثقين المنتدبين، منشورات دار الكتب القانونية، مصر، ٢٠١٠، لاپەڕە ٧ بەدواوە.

وای کردبوو کە چەند کەسێك پێکەوە پەیوەندی سێکسی لەگەڵ ئافرەتێك بکەنو بۆ ئەم مەبەستە جاری وا هەبوو بە کۆمەڵێك پیاو یەك ژنیان دەبوو جا گرینگ نەبوو ئەوکەسانەکێنو چی یەکترن باوكو کوڕ یان برای یەکترن یان بێگانەن کەواتە سێکس لەنێوان ئەم کۆمەڵگایەدا ڕێگاپێدراو (مباح) بووە.

بەڵام لە قۆناغی دووەمدا لەلایەن گەلانی کۆندا ئەم دابو نەریتە نەماو بۆ دابینکردنی هاوسەرگیری پەنایان دەبردەبەر هەڵگرتنو ڕفاندنی ئافرەت بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێك هێرشیان دەبردەسەر کۆمەڵەکەی ترو ئافرەتانی ئەوانیان دەڕفاندو پەیوەندی هاوسەرگیریان لەگەڵ دەبەستن.

لەم قۆناغەدا بیرۆکەی پێکنەشیان (المحارم) پەیدا بوو، بەم پێیە نەدەبوو کەسێك خوشكو پلكو ژنی باوكو باپیرانو ژنی کوڕی خۆی کچی خۆی بهێنێ. ئەم سیستەمە لە یاسای ڕۆمانی جێگیر ببوو، ڕۆمەکان لەسەری دەڕۆیشتن. بەڵام میسرییە کۆنەکان بەپێچەوانەی ڕۆمەکان زیاتر هاوسەرگیرییان لەگەڵ ئەو کەسانە پێ خۆش بوو کە بۆیەك نەدەشیان.

بەڵام ئێستاکە لەلایەن کۆمەڵگای هاوچەرخو بەپێی گشت ئایینە ئاسمانیەکان و یاسای بەرکار بیرۆکەی (نەهێشتنی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بۆیەك ناشێن) جێگیر بووەو زۆربەی حوکمە یاساییو شەرعیەکان لەم بارەیەوە لەیەك دەچن. بەم پێیە ئێستا ئازادی ڕێککەوتنی هاوسەرگیری ڕەها نیە بەڵکو پابەندی کۆمەڵێك کۆتو مەرجەو مرۆڤ دەبێ لەکاتی ڕێککەوتنی هاوسەرگیریدا پابەندیان بێت.

یاسای باری کەسیی عێراقی ژمارە ١٨٨ ی ساڵی ١٩٥٩ ی هەموارکراو ماددەکانی (١٣،١٤،١٥،١٦،١٧)ی بۆ حوکمەکانی پێکنەشیان (محارم) تەرخان کردووە.

هەروەها خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەو کەسانەی دەستنیشان کردووە کە بۆ هاوسەرگیری پێك ناشێن. کەواتە بەپێی یاساو شەرع دوو جۆرە پێکنەشیانی هاوسەرگیریمان هەیە. جۆرێکیان هەمیشەییە ئەوەی تریان کاتییە.

**جۆری یەکەم** خزمایەتیو تێکەڵبوون بە ژنهێنان (مصاهرة)و شیرپێدان دەگرێتەوە.

**جۆری دووەم** ڕاگرتنی زیاتر لە چوار ژن بەیەکەوە هەروەها بێ دینیو دەستلێکبەردانی سێ بەسێو بوونی مافی کەسانی تر بە ڕێککەوتنی هاوسەرێتیو عیددەو هەستانی یەکێك لە پێکنەشیاوەکان لەکاتی هاوسەرێتیدا بە ڕێککەوتنی هاوسەری لەگەڵ پێکنەشیاوەکەی تردا.

لەڕاستیدا، پێکنەشیانی نێرینەو مێیینە بۆیەکتری لەسەر بنچینەی ئەوە بۆتە هی هەمیشەییو ناهەمیشەیی ئایا هۆی پێکنەشیانەکە هەمیشەییە یان کاتییە.

جا لەبەرئەوەی هۆی جۆری یەکەم لە پێکنەشیانەکە هەمیشەییە بۆیە پێکنەشیانەکەش هەر هەمیشەیی دەبێت، بەڵام هۆی پێکنەشیانی جۆری دووەم دەکرێ نەمێنێ، بۆیە پێکنەشیانەکەش پابەندی ئەو هۆکار کاتییەیەو لەگەڵ نەمانی هۆکارەکەی نامێنێو هەربۆیە ناوی نراوە پێکنەشیانی کاتی. لەم بارەیەوە یاسادانەری عێراقی لە مادده/١٣ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا بەم شێوەیە پێکنەشیان بۆ دوو جۆر دابەش دەکات.

هۆیەکانی پێکنەشیان دوو بەشە هەتا هەتاییو کاتی، هەتاهەتاییەکە خزمایەتیو مصاهرەو شیرپێدان دەگرێتەوە، بەڵام کاتییەکە کۆکردنەوەی زیاتر لە چوار ژنو بێ دینیو تەڵاق کەوتووی سێ بەسێو بوونی مافی کەسانی تر بە ڕێککەوتنی هاوسەرگیریو عیددەو هەستانی یەکێك لە پێکنەشیاوەکان بە ڕێککەوتنی هاوسەری

لەگەڵ پێکنەشیاوەکەی تردا لە کاتێکدا کە ئەو ڕێککەوتنە هاوسەرگیرییەی کە بۆتە هۆی پێکنەشیاویەکە هەر لە ئارادا بێت. لە خوارەوە لە دوو خاڵدا بە درێژی باسی هەردوو جۆری پێکنەشیانە (هەمیشەیی‌و کاتی)ەکە دەکەین.

## یەکەم: پێکنەشیانی هەمیشەیی

ئافرەت بەشێوەیەکی هەمیشەیی نەشیاو (محرمة) دەبێ ئەگەرهاتوو هۆی نەشیاوێتیەکە هەمیشەیی بێت‌و لانەچێت. هۆیەکانی نەشیاوێتیش لە ماددە/١٣ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتوونە هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێی کرد کە سێ هۆنە، پێکنەشیان بەهۆی خزمایەتیەوە، وپێکنەشیان بەهۆی زاوایەتی (مصاهرة) یەوە ، وپێکنەشیان بەهۆی شیرپێدانەوە. لەخوارەوە لە سێ خاڵدا باسیان دەکەین:

### ١- پێکنەشیان بەهۆی خزمایەتیەوە

بەپێی ماددە/١٤ ی یاسای باری کەسیی عێراقی[١] ئەوکەسانەی خوارەوە بەهۆی پەیوەندی خزمایەتیەوە هەمیشە پێکناشێن،پیاو ناتوانێ دایکی خۆی وەیان داپیری خۆی بهێنێ‌و هەروەها بۆسەرەوە تریش وەك دایکی داپیری.

هەروەها کچی‌و کچی کوڕەکەی یان کچی کچەکەی هەروەها بۆ خوارەوە تریش وەك کچی کچی کچەکەی، هەروەها خوشکی خۆی یان کچی خوشکی خۆی یان

---

[١] - لە ماددە/١٤ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((١- پیاو لێی حەرامە، ژن لە ڕەچەڵەکی دایك‌و باپیری‌وبەرەو سەرەوە تریش بهێنێت، هەروەها کچی‌و کچی کوڕی بەرەو خوارەوەش. هەروەها خوشکی خۆی‌و کچی خوشکی‌و کچی برای‌و بەرەو خوارەوەش. هەروەها خوشکی باوك‌و خوشکی باپیری بۆسەرەوە تریش‌و خوشکی دایك‌و خوشکی داپیری‌و بۆسەرەوە تریش.
٢- ژن لێی حەرامە مێرد بە هاوچەشنی ئەو پیاوانە بکات)).

کچـی بـرای هـەروەها خوشـکی بـاوکی یـان خوشـکی بـاپیری بۆسـەرەوە تـریش هەروەها خوشکی دایکـی یـان خوشـکی داپـیری بۆسـەرەوەتریش.هەروەها ژنـیش بۆی نیە ڕێککەوتنی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو گروپانە لە پیاو ببەستێ.
لەمبارەیەوە خوای گەورە لە سوورەتی نساء ئایەتی (٢٣)فەرموویـەتی: ((حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالاتُكُمْ وَبَنَاتُ الأَخِ وَبَنَاتُ الأُخْتِ))
واتە: ((لێتان حەرام کراوە مارەکردنی دایکانتـا، کچـانتان، خوشـکانتان، خوشـکی باوکتان، خوشکی دایکتان، کچانی براکانتان، کچانی خوشکانتان)) .

## ٢- پێکنەشیان بەهۆی زاوایەتی (مصاهرة)وە

لەمادده/١٥ ی یاسای باری کەسیی عێراقیـدا هـاتووە: ((پیـاو لێـی حەرامـە کچـی هاوسـەری خـۆی کـە لەگەڵیـدا جـووت بـووە، هـەروەها دایکـی هاوسـەرەکەی کـە مـارەیی بڕیوەبهێنێـت، هـەروەها لێـی حەرامـە هاوسـەری هاوسـەری ڕەچـەڵەکی خۆیو بەرەو سەرەوەشو هاوسەری وەچەی خۆیو بەرەو خوارەوەش بهێنێت)).
بەپێی ئەم ماددەیە ئەگەر یەکێك ئافرەتێکی کردە هاوسەری خۆی بۆ هەتاهەتایـە دایکی ئەوی لێ حەرام دەبێـت واتـە پێـی ناشـێت هـەروەها داپـیری هاوسـەرەکەی هەروەها هەرچەندی بۆسەرەوەتریش بچێت. هەروەها بۆی نیە کچی هاوسەرەکەی بهێنێـ هـەروەها هەرچـەندی بـۆ خـوارەوە تـریش بچـیت وەك کچـی کچـی هاوسەرەکەی. بەڵام ئەگەرهاتوو پەیوەندی هاوسەرێتیان پچڕا بە هەڵوەشـانەوەی ڕێکەوتنەکە وەیان دەست لێکبەردانیان ئەوکاتە بۆی هەیە بیانهێنێ.

بەکورتی ئەوکەسانەی خوارەوە بەهۆی مصاهەرەوە ناشێن هاوسەرگیرییان لەگەڵ بکرێ:

ژنی باوكو باپیریو بەرەو سەرەوە، ژنی کوڕو کوڕی کوڕو بەرەو خوارەوە، دایکی ژنـیو دایکـی داپـیریو بـەرەو سـەرەوە، کچـی ژنـی ڕەبیبـەو کچـەکانیو کچـی منداڵەکانی.

ئەوەی شایەنی باسە، خوای گـەورە لەمبارەیـەوە لـە سـوورەتی نسـاء لـە ئایـەتی (٢٢) دەفەرموێ: ((وَلا تَنْكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ إِنَّـهُ كَـانَ فَاحِشَـةً ومَقْتًـا وسَـاءَ سَبِيلاً)) واتـە ژنانـێ کـە باوکانتـان مارەیـان بڕیـون مارەیـان مەبڕن، مەگەر ئەوە کە بەر لەم حوکمە کرابێ، چونکە ئەمە خراپـەو نەشـیاوە، وە ڕقهێنەرەو ڕەوشتێکی بەدفەڕە .

هـەروەها لـە ئایـەتی (٢٣) لـە هـەمان سـوورەتدا دەفـەرموێ: ((وَأُمَّهَـاتُ نِسَـائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَائِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُـوا دَخَلْتُمْ بِهِنَّ فَلا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلابِكُمْ)).

واتە دایکانی خێزانتانو کچانی ژنانتان کە لـە مـاڵی ئێـوە گـەورەبوون، لـە ژنانـێ کـە دەستتان لەگەڵیان تێکەڵاو بووە، بەڵام ئەگەر تێکەڵتان نـەبووبێ، مـارەکردنی کچـانی ئەوانە گوناح نیە بۆتان، هەروەها ژنانی کوڕانی پشتی خۆتان لێتان حەرامە.

### ٣- پێکنەشیان بەهۆی شیرپێدانەوە

لـە مـاددە/١٦ ی یاسـای بـاری کەسـیی عێراقیـدا هـاتووە: ((هەرکەسـێك بـە خزمایەتیو زاوایەتی حەرام کرابێت، بـە شـیرپێدان حـەرام دەبێـت، جگـە لەوانـەی شەرع ڕیزپەڕی کردوون )).

بەپێی حوکمەکانی ئەم ماددەیە ئەوانەی بەهۆی خزمایەتی وەیان زاوایەتی پێکناشێن بەهۆی شیرپێدانیش پێکناشێن، لەم بارەیەوە خوای گەورە لە سوورەتی نساء لە ئایەتی (٢٣)فەرموویەتی: ((وَأُمَّهَاتُكُمُ اللاَّتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ)) واتە لێتان حەرام کراوە مارەکردنی دایکانێ کە شیریان بە ئێوە داوەو هەروەها خوشکانی شیریش.

هەروەها لەمبارەیەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ((یحرم من الرضاع مایحرم من النصب)).

## دووەم: پێکنەشیانی کاتی

ئەو ئافرەتانەی بەشێوەیەکی کاتی نەشیاو دەبن، ئەو ئافرەتانەن کە لەبەر چەند هۆیەکی نائاسایی نەشیاو دەبن، جا ئەگەر ئەو هۆیانە نەمان نەشیاوێتیەکەشیان نامێنێ‌و شیاو دەبن بەپێی پرنسیپی ئەگەر ئەوشتەی بەرهەڵستە لابچێ قەدەغەکراو دەگەڕێتەوە (اذا زال المانع عاد الممنوع).

### ١- هێنانی ژنی پێنجەم

بەپێی حوکمەکانی ماددە/١٣ ی یاسای عێراقی پیاو بۆی نیە ژنی پێنجەم بهێنێ ئەگەرهاتوو چوار ژنی تریشی هەبێت‌و گرێبەستی هاوسەرگیریی لە نێوانیاندا هەبێت‌و هەر هەمووشیانی لە ئەستۆ مابێت. لە ماددەی ناوبراودا هاتووە: ((...نەشیاوی کاتی بریتییە لە حاڵەتی کۆکردنەوەی پتر لە چوار ژن‌و...)).

هەروەها لەم بارەیەوە خوای گەورە لە سورەتی النساء لە ئایەتی (٣) فەرموویەتی ((فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاثَ وَرُبَاعَ)) واتە دوان یان سیان یا چوار ژن بۆخۆتان مارەی بڕن.

بەلاًم هەرکاتێك یەکێك لە هاوسەرەکانی گیانی لەدەستدا وەیان پەیوەندی نێوانیان بە هۆیەك لە هۆیە یاسایی‌و شەرعییەکان پچڕا وەك تەلاًق وەیان دەستلێکبەردانی دادگەیی، ئەوکاتە هیچ بەربەستێك بۆ هێنانی ژنی پێنجەم نامێنێ.

### ٢- بێ ئایین‌و بێ ئایینی ئاسمانی

بەپێی مادده/١٣ ی یاسای باری کەسیی عێراقی هیچ موسڵمانێك بۆی نیە ژنێکی بێ ئایین یان موشریك وەیان بتپەرست یان ژنێك هیچ باوەڕی بە ئایینە ئاسمانیەکان نەبێت بهێنێ.

لەمبارەیەوە خوای گەورە لە سوورەتی (الممتحنة) لە ئایەتی (١٠) فەرموویەتی: ((وَلا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الكَوَافِرِ)) واتە ژنانی کافر بە ژنانی خۆتان ڕامەگرن. بەلاًم ئەو ژنانەی باوەڕیان بە ئایینێکی ئاسمانی بێ لە ئایینی ئیسلام هەبێت وەك جوولەکەو دیان بە موسڵمان دەشێن، هەروەها ئەو ژنەی بێ ئایینە ئەگەر باوەڕ بهێنێ. لەم بارەیەوە خوای گەورە لە سوورەتی (بقرة) لە ئایەتی (٢٢١) فەرموویەتی: ((وَلا تَنْكِحُوا المُشْرِكَاتِ حَتَّى يُؤْمِنَّ)) واتە ژنانی موشریك مارە مەکەن مەگەر بڕوا بێنن.

### ٣- سێ بەسێ تەلاًق کەوتوو

بەپێی هەمان مادده[١] ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی سێ بەسێ تەلاًق بدات بەشێوەیەکی کاتی پێك ناشێن. وە ئەم نەشیاوێتیەش بە مێردکردنەوەی بە یەکێکی ترو دەست لێکبەردانیان یان بە مردنی مێردی ژنە تەلاًق دراوە سێ بە سێ کەو تێپەڕبوونی ماوەی عیددە کۆتایی دێت.

---
[١] - مادده/١٣ ی یاسای باری کەسیی عێراقی.

مەبەست لە سێ بەسێ تەلاٌقکەوتوو ئەو جۆرە تەلاٌقەیە کە لە سێ دانیشتنی جیاواز لە کاتو شوێندا کەوتبێ، هەروەکو لە دەقی ماددە/ ٣٧ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە[١].

بەڵگەی شەرعی بۆ ئەم نەشیاوێتیەش فەرموودەی خوای گەورەیە کە لە سوورەتی (بقرة) لە ئایەتی (٢٣٠) دەفەرموێ: ((فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)) واتە ئەگەر دوای دوو تەلاٌقەکەو گەڕانەوەی بۆ جاری سێیەم ژنەکەی تەلاٌق دا، لەوە دوا، دوای تەلاٌقی سێیەم ئەو ژنەی بۆ حەلاٌڵ نیە، مەگەر مێردێکی تر بکاتو لەگەڵیشی جووت بێ، جا ئەگەر مێردە دووەمەکە ئەوی تەلاٌق دا گوناحیان لەسەر نابێ ئەگەر بگەڕێنەوە لای یەکترو ببنەوە حەلاٌڵی یەکتر.

بەڕای من گرێبەستی هاوسەرگیری وەك هەر گرێبەستێکی تر، بۆ بەرژەوەندی مرۆڤایەتیو پێویستی بەردەوام بوونی ژیانی کۆمەلاٌیەتی هاتۆتە ئاراوە. جا وێڕای هەندێك جیاوازی لە نێوان گرێبەستێكو گرێبەستێکی تر بەپێی ئەو ناوەڕۆکەی کە لەخۆی گرتووە یان ئەو بوارەی کە ڕێکی خستووە، دەکرێ لایەنەکانی گرێبەستەکە چ بەپێی ڕێككەوتنی خۆیان یان بڕیاری دادگا خۆیانی لێ ئازاد بکەن، یانیش بە پێچەوانەوە دوای هەڵوەشاندنەوەی جارێکی تر بە گرێبەستێکی نوێوە بگەڕێنەوە لای یەکتری.

---

[١] -دەقی ماددە/٣٧ ی یاسای باری کەسیی عێراقی: ((١- مێرد سێ تەلاٌقی دەرهەق بە ژنەکەی بە دەستەوەیە.

٢- تەلاٌقدانی گوتراو بە ژمارە چ بە قسە یان بە ئاماژەبۆکردن تەنیا یەك تەلاٌق دەخات.

٣- ئەو ژنەی سێ جاری جیا جیا تەلاٌق بدرێت، دەبێتە تەلاٌقی جوداکەری گەورە (بينونة كبرى).

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە چ پێویست دەکات ڕێگری لەهاوسەرەکان بکرێت جارێکی تر ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ یەکتری پێکەوە بنێنەوە هەتا ئەگەرهاتوو زیاتر لە سێ جارانیش ژیانی هاوسەرگیری پێشوویان کۆتایی پێ هێنابێت.

بە مانایەکی تر، ئەم پۆلینکردنەی تەلاقو دەستلێکبەردانە، چ پێویست دەکات، مەبەستم دابەشکردنی تەلاق بۆ تەلاقی بەرگەڕانەوەو تەلاقی جوداکەری بچووكو تەلاقی جوداکەری گەورە، لەکاتێکدا هەروەکو دەزانین ئەم گرێبەستەش وەکو گشت گرێبەستەکانی تر ئارەزوومەندانەیەو بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکان بڕیاری لەسەر دراوە جا چ پێویست بەوە دەکات ئەرکی سەرشانی هاوسەرەکان لەکاتی تەلاقی جوداکەردا قورس بکرێت، لەکاتێکدا ئەگەر خۆیان ئەوەیان نەوێت. بۆیە داوا لە یاسادانەری عێراقو پەرلەمانی کوردستان دەکەم یاسای باری کەسی هەمواربکەنەوەو ئەم کۆسپو تەگەرانەش لە بەردەم هاوسەرەکان هەڵبگرنو ڕێگایان پێبدەن کە لەدوای پچڕانی پەیوەندیی هاوسەرگیری بە هەر هۆیەك بێت لەوانەش فڕێدانی سێ تەلاقی جیا لە سێ کاتو شوێنی جیا لەلایەن مێردەکەوە یان ئەو دەستلێکبەردانەی لە حوکمی ئەودایە، جارێکی تر ژیانی هاوسەرگیری لەگەڵ یەکتری درێژە پێ بدەنەوە، چونکە ئەوە زۆر باشترە لەوەی ڕێگایان لێ بگرینو چەندین کێشەی تری کۆمەڵایەتیان لە ئاکامی ئەمەدا بۆ دروست بکەینو ئەم پەیوەندییە بۆ هەتاهەتایە بپچڕێنینو ئەو خانەوادەیە لە یەکگرتنەوە بێ ئومێد بکەین.

**٤- ژنێك مافی کەسێکی تری بەسەرەوە بێ وەیان عیددەی بەسەر نەچوبێ**

ئـافرەتی بــە مێــرد مــافی کەســانی تــری بەســەرەوەیە، بۆیــە تــا گرێبەســتی هاوسەرگیری لەنێوان ئەو ژنەو مێردەکەی کۆتایی پـێ نەیـەت، چ لـەڕێگای مردنـی هاوسەرەکەی وەیـان بـەهۆی دەسـت لێکبـەردانیانو تێپـەڕبوونی مـاوەی عیـددە، کەسێکی تر بۆی نیە مارەی بکات.

ماوەی عیـددەش بـەپێی جـۆری عیددەکـە دەگـۆڕێ، بۆیـە گـرینگ نیـە عیددەکـە عیددەی دەست لێکبەردان بێت، یان عیددەی مردن، یان عیددەی سکپڕی بێت.

لەبارەی عیددەی دەستلێکبەردانەوە خوای گەورە لە سوورەتی بەقەرە لە ئایـەتی (٢٢٨) دەفەرموێ: ((وَالمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ ثَلاثَةَ قُرُوءٍ)) واتـە ژنـانی تـەلاَق دراو دەبێ بۆماوەی سێ جار تێکەوتنو پاك بوونەوە لە خوێنی بێنوێژی چاوەڕوان بن واتە لەسەر مێردەکەیان ڕاوەستن .

هـەروەها لـەبارەی عیـددەی مردنـەوە لـە سـوورەتی بەقـەرە لـە ئایـەتی (٢٣٤) دەفەرموێ: ((وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنْفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا)) واتە کەسانێ کە لە ئێوە دەمرنو ژنانێك بـەجێ دێڵـن دەبـێ چـوارمانگو دە ڕۆژ چاوەڕوان بن.

هـەروەها بـۆ عیـددەی ئـەو ژنـەی کـە سـکی پـڕەو تـەلاَق دراوە یـان سـکی پـڕەو پیاوەکـەی مـردووە لـە سـوورەتی تـەلاَق لـە ئایـەتی (٤) دەفـەرموێ: ((وَأُولاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ)) واتـە عیـددەی ژنـانی دووگیـان ئەوەیـە کـە لـە منداڵ ببنەوە. کەواتە پیاوێكو ژنێکی بە مێرد یان ژنێکی تەلاَق دراو بـەلاَم مـاوەی عیـددەی بەسەرنەچـووبێ، وەیـان ژنـی مردوێـك بـەلاَم عیـددەی بەسەرنەچـوبێ بەیەکتری ناشێن، بەلاَم هەرکاتێك ئەو هۆیانە نەمان ئەوکاتە بەیەکتری دەشێن.

## ٥- هێنانی خوشکێك بەسەر خوشکەکەی تردا

ناشێ پیاو ببێتە هاوسەری خوشکی ژنەکەی تا لەگەڵ ژنەکەی دەست لێك بەرنەدەن، وەیان نەمرێتو ماوەی عیددەشی لە هەردوو حاڵەتدا بەسەرنەچێت.
لەمبارەیەوە خوای گەورە لە سوورەتی النساء لە ئایەتی (٢٣) فەرموویەتی: ((وَأَنْ تَجْمَعُوا بَيْنَ الأُخْتَيْنِ إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ)) واتە لێتان حەرام کراوە مارەکردنی دوو خوشك پێکەوە مەگەر ئەوەی بەر لەم حوکمە کرابێ.

## سێیەم: خواستنی خاوەن کتابە ئاسمانیەکان

دەکرێ پیاوی موسڵمان ژنێکی خاوەن کتابێکی ئاسمانی وەك جولەکە یان دیان بهێنێ چونکە هەردووکیان لەسەر ئایینی ئاسمانین، بەڵام نابێ ژنێك بهێنێ کە باوەڕی بەهیچ ئایینێکی ئاسمانی نەبێ وەك بتپەرستێك یان گاپەرستێك هەروەها مێردکردنی ژنێکی موسڵمان بە ناموسڵمانێك هەرچەندە خاوەن کتابی ئاسمانی بێت دروست نیەو حەرامە.
یاسای باری کەسیی عێراقی ناوبراو لەمبارەیەوە لە مادده/١٧ دەقنووسی کردووە: ((دروستە پیاوی موسڵمان ژنێکی کتابی بهێنێت، بەڵام دروست نیە ژنێکی موسڵمان، مێرد بە پیاوێکی ناموسڵمان بکات.
هەروەها خوای گەورە لەمبارەیەوە لە سوورەتی مائیدە لە ئایەتی (٥) دەفەرمێ: ((اليَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَالمُحْصَنَاتُ مِنَ المُؤْمِنَاتِ وَالمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ)).

واتە ئەمڕۆ خواردەمەنی پاك بۆ ئێوە حەلاڵ کراوە هـەروەها خواردەمـەنی ئـەهلی کتاب بۆ ئێوە حەلاڵەو خواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان حەلاڵـە، وە هـەروەها ژنـانی داوێن پاك لە بڕواداران‌و ژنانی داوێن پاك لە کەسانێ کە بەر لە ئێـوە کتێبیـان پـێ دراوە بەو مەرجەی مارەیی‌و ئەجریان بدەنێ.

## ٤- ئاکامەکانی گرێبەستی هاوسەرگیری

گرێبەستی هاوسەرگیری هەندێك ئاکامی هەیە، لەوانە کە تایبەتە بە ژن، هەندێکی تری تایبەتە بە پیاو، هەندێکی تریشتایبەتە بە هەردووکیان واتە هاوبەشە لەنێوان هەردوو هاوسەرەکە.

لەخوارەوە لە سێ خاڵدا باسیان دەکەین:

### أ- مافەکانی ژن

ژن هەندێك مافی لەسەر مێردەکەیـەتی، هەنـدێکیان مـافی دارایـین، وەك مـارەیی‌و بـژێو، هەنـدێکی تریشـیان نـادارایین وەك مامەڵـەکردن بـە شـێوەیەکی بـاش‌و دادپەروەرانە، لەخوارەوە لە سێ خاڵدا باس لەم مافانە دەکەین:

#### یەکەم: مارەیی

مـارەیی بـەپێی قورئـانی پـیرۆز [١] و فـەرموودەی پێغەمبـەر [١] و بـیروڕای یاسـازانان‌و بەپێی حوکمەکانی یاسای باری کەسیی عێراقی بەرکار مافێکی ڕەوای ژنە [٢].

[١] - خوای گەورە لە سوورەتی النساء لـە ئایـەتی (٤) دا فەرموویـەتی: ((وَآتُـوا النِّسَـاءَ صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَـةً فَإِنْ طِبْنَ لَكُمْ عَنْ شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيئًـا مَّرِيئًـا)) واتـە بـەناوی پێشـکەش مـارەیی ژنـان بـدەن، جـا گـەر ژنەکان بە دڵ شتێکیان لەو مارەییە بە ئێوە بەخشی‌و حەلاڵی بیخۆن. هـەروەها لـە ئایـەتی (٢٤) لـە هـەمان

بەو بڕە پارەیە یان بەها داراییە دەوترێ مارەیی کە ژن لە مێردی خۆی بەهۆی ڕێککەوتنی هاوسەری وەیان بە جووتبوون دەیکەوێ.

شایەنی وتنە، هەموو ژنێك لەڕێگای گرێبەستی هاوسەرگیریدا ئەو مارەییەی دەکەوێ، بەلاَم لە ئەنجامی دەست لێکبەردانی بەر لە گواستنەوەو جووتبوون نیوەی دەسووتێ.

مارەیی لەڕووی کاتی دانەکەی دەبێتە مارەیی پێشەکی(المعجل)و مارەیی دوایی (المؤجل) هەروەها لەڕووی دیارکردنو نەکردنی بڕی مارەییەکە دەبێتە مارەیی ناونراو (المهر المسمى) و مارەیی هاوچەشن(مهر المثل).

لەڕاستیدا، ئەگەر بڕی مارەییەکە لەناو گرێبەستی هاوسەرگیریدا دیارکرا، ئەوا هیچ گیروگرفتێك ڕونادات، بەلاَم ئەگەر ئەم بڕە دیارنەکرا ئەوا مارەیی هاوچەشنی بۆ دیار دەکرێ. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ مەسەلەی تەمەنو جوانیو لەش ساغیو ئاقڵیو باری داراییو پەردەی کچێنی لەبەرچاو بگیرێ.

هەرچەندە مارەیی مافێکی ڕەوای ژنەو لەڕێگای گرێبەستی هاوسەرگیریدا دەیکەوێ، بەلاَم دیارنەکردنی ئەم مارەییە لەناوگرێبەستەکەدا نابێتە هۆی پووچەڵکردنەوەی گرێبەستەکە، بەڵکو سەرەڕای ئەمە گرێبەستەکە بە

---

سوورەتدا دەفەرموێ: ((فَمَا اسْتَمْتَعْتُمْ بِهِ مِنْهُنَّ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ)) واتە جا ئەگەر دەستتان لەگەڵ تێکەڵکردن، ئەجرو هەقەکەیان بەناوی فەرزو واجب بدەنێ.

[1] -لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ): ((التمس ولو خاتما من حديد)) وەرگیراوە لە عن نظام الدين عبد الحميد: احكام الاسرة في الفقه الاسلامي، سەرچاوەی پێشوو ل١٥٦.

[2] - یاسای باری کەسیی عێراقی بەرکار لە بابی سێیەم لەژێر ناونیشانی (مافەکانی هاوسەرێتیو حوکمەکانی) لە فەسڵی یەکەم لە مادده/ ١٩ تاکو مادده/ ٢٢ ی بۆ مارەیی تەرخان کردووە.

گرێبەستێکی ڕاست‌و دروست لەقەڵەم دەدرێ‌و بۆ دیارکردنی مارەییەکەش پەنا دەبرێتە بەر مارەیی هاوچەشن بەو شێوەیەی سەرەوە، چونکە مارەیی ڕایەڵێك (رکن) نیە لە ڕایەڵەکانی گرێبەستی هاوسەرگیریدا.

هەروەها ئەکەر کاتی دانی مارەییەکە دیارنەکرابوو، ئەوا هەرکاتێك ژنەکە داوای بکا موستەحەق دەبێ[1].

بەپێی مادده/١٩ ی یاسای باری کەسیی عێراقی بەرکار ژن مافی مارەیی ناوبراو لە گرێبەستی هاوسەرێتییەکەی هەیە، وە ئەگەر ناویشی لێ نەهێنرا ئەوا مافی مارەیی هاوچەشنی هەیە.

ئەمەی خوارەوە دەقی ماددەی ناوبراوە: ((١- ژن مافی ئەو مارەییەی هەیە کە لە گرێبەستی هاوسەرێتی دیارکراوە، ئەگەر دیاری نەکرابوو یا لە بنەڕەتەوە نکۆڵی لێ کرا، ئەوا مارەیی هاوچەشنی دەدرێتێ.

٢- ئەگەر خوازبێن برێك دارایی پێش بەستنی گرێبەستەکە بەناوی مارەییەوە بە دەسگیرانەکەی دا، دوایی لایەنێکی گرێبەستەکە لەسەر بەستنی گرێبەستەکە پەشیمان بووەوە یان مرد، دەتوانرێ ئەم داراییە

وەرگیراوە بگەڕێندرێتەوەو ئەگەر لەناویش چووبێت لەجیاتیەکەی وەردەگیرێت.

٣- حوکمەکانی بەخشین لەسەر دیارییەکان پەیڕەو دەکرێت)).

لە دەقی ئەم ماددەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە مارەیی لەسەر ئەستۆی پیاوە نەك ژن، وە بە بوونی گرێبەستی هاوسەرگیری دروست یان بە جووتبوون دێتە دی.

---

[1] -بڕیاری دادگای پیاچوونەوە (محكمة التمييز)ی عیراقی ژمارە (٤٢٨) کەسایەتی/١٩٨ لە ١٩٧٨/٣/٢ مجلة الاحكام العدلية ژمارە (١) ی ساڵی ١٩٧٨ ل٧٢.

هەروەکو بەرلە ئێستا ئاماژەمان پێی کرد مارەیی دوو جۆری هەیە، یەکێکیان ناو نراوە ئەوەی تریشیان هاوچەشنە.

مارەیی ناونراو ئەو مارەییەیە کە لە کاتی بەستنی گرێبەستەکە بە ڕاشکاوەیی ناوی لێ نراوەو لەسەری ڕێك کەوتوون. بەلاَم مارەیی هاوچەشن ئەو مارەییەیە کە لە کاتی فرامۆشکردنیدا لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا پەنای دەبردرێتە بەر. لە سێ حالەتدا ژن مافی مارەیی هاوچەشنی هەیە، کە ئەمانەی خوارەوەن:

أ–ناونەهێنانی مارەیی لە گرێبەستێکی دروست دا، بۆنموونە پیاوێك بە ئافرەتێك بلێ میردم پێ بکە، ئافرەتەکەش بلێ مێردم پێ کردی، لەم حالەتەدا ژنەکە مافی مارەیی هاوچەشنی هەیە مادام لەسەر بڕی مارەییەکە ڕێك نەکەوتوون.

ب_ئەگەر هەردوو هاوسەر ڕێککەوتبن لەسەر دوورخستنەوەی مارەییەکە، بۆنموونە پیاوێك بە ئافرەتێك بلێ تۆم هێنا بەو مەرجەی مافی مارەییت نەبێ، ئەویش بلێ قبوولم کرد. لەم حالەتەدا مەرجی دوورخستنەوەی مارەییەکە پووچەل دەبێتو گرێبەستەکەش دروست دەبێت، واتە ژنەکە مافی مارەیی هاوچەشنی دەبێت.

ج_ئەگەرهاتوو مارەییەکە جۆرەکەی یان ڕەگەزەکەی دیار نەبوو، بۆنموونە مارەییەکە خانوێك یان پارچە زەوییەك بێت بەبێ ئەوەی دیاربکرێ.

د–ئەگەرهاتوو ئافرەتێك مارەیی ئافرەتێکی تر بوو، بۆنموونە لە هاوسەرگیری ژن بە ژن دا ئەگەرهاتوو هەریەکێك لە ژنەکان مارەیی ژنەکەی تر بێت، لەم حالەتەدا سەرەڕای ئەم ناوهێنانە هەریەکێك لە ژنەکان (بنپشکەکان) مافی مارەیی هاوچەشنی هەیە.

هـ–ئەگەرهاتوو ژنەکە نەیتوانی مارەییە ناونراوەکە بسەلمێنێ دادگا بۆی هەیە پەنا بباتەبەر دیارکردنی مارەیی هاوچەشن[1].

**حوکمی پێشخستن‌و دواخستنی مارەیی:**

لە دەقی مادده/٢٠ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((١–دەتوانرێت هەموو مارەیی یان هەندێکی پێشەکی وەربگیرێت یا دوابخرێت. ئەگەر دەقێك لەسەر ئەوانە نەبوو ئەوا پەیڕەوی داب‌و نەریت دەکرێت.

١– بە مردن‌و تەلاَقدان ماوەی دیاریکراو لە گرێبەستەکە بۆ وەرگرتنی مارەیی نامێنێت)).

لە دەقی ئەم ماددەیەدا بۆمان دەردەکەوێ کە هاوسەرەکان بۆیان هەیە هەموو مارەییەکە یان هەندێکی دوابخەن بۆ نزیکترین کات لە تەلاَق یان مردن وە بەشەکەی تریشی پێش بخەن.

بەلاَم ئەگەر دەقێك لەسەر ئەمانە نەبوو ئەوکاتە بەپێی داب‌و نەریت کار دەکرێ.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بەپێی ئەو داب‌و نەریتەی لە عێراقدا باوە لە گرێبەستی هاوسەرگیریدا هاوسەرەکان لەسەر پێشخستنی بەشێکی مارەییەکەو دواخستنی بەشەکەی تری ڕێك دەکەون.

هەروەها ئەگەرهاتوو ماوەیەك بۆ پێشکەشکردنی مارەییەکە دیاری کرابوو بە تەلاَقدان یان مردن ئەو ماوەیە نامێنێ‌و لەکاتی ڕوودانی یەکێك لەو ڕووداوانەدا ژنەکە مافی وەرگرتنی مارەیی دەبێت.

---

[1] - بڕیاری دادگای پیاچوونەوە (محكمة التمييز)ی عیراقی ژمارە (٤٣٦) کەسایەتی یەکەم/٩٧٢ لە ١٩٧٢/٤/٢٠ مجلة النشرة القضائية سالّی ١٩٧٢ ل١٩٨. هەروەها بڕیاری دادگای پیاچوونەوە (محكمة التمييز)ی عیراقی ژمارە (١٧٨٤) کەسایەتی/١٩٧٥ لە ١٩٧٥/١٢/٢٢ مجلة الاحكام العدلية ژمارە (٤) ی سالّی ١٩٧٥ ل٨٣.

مارەیی پاشەکی (دواخراو) جێگیرنابێت لە ئەستۆدا هەروەها ناکرێ داوا بکرێ مەگەر دوای جووتبوون[1].

وە ئەگەرهاتوو پیاوەکە مارەییە پێشەکیەکە نەداتە هاوسەرەکەی، بۆی هەیە گوێڕایەڵی مێردەکەی نەبێت[2].

هەروەها ئەگەرهاتوو لەکاتی بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیریەکەدا پاشەکی مارەییەکەی دیار نەکرابوو، نابێ مارەیی هاوچەشنی بۆ ببڕێتەوە[3].

هەروەها نەدانی مارەییە پێشەکییەکە لەلایەن مێردەکەوە بۆ ژنەکەی نابێتە هۆی هەڵوەشانەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکە، بەڵکو بۆی هەیە گوێڕایەڵی نەبێت تاکو دەیداتێ[4].

**لەچ کاتێك ژن مافی هەموو مارەییەکەی دەبێت:**

دوای جووتبوون یان مردنی یەکێك لە هاوسەرەکان ژنەکە مافی وەرگرتنی هەموو مارەییە دیاریکراوەکەی هەیە.

## لەچ کاتێك ژن مافی نیوەی مارەییەکەی دەبێت:

دوای تەلاقدان بەر لە جووتبوون ژنەکە مافی وەرگرتنی نیوەی مارەییەکەی هەیە[1].

---

[1] -بڕیاری دادگای پیاچوونەوەی عێراقی ژمارە ١٧٨٤ /کەسایەتی/١٩٧٥ لە ١٩٧٥/١٢/٢٢ مجلة الاحكام العدلية العدلية ژمارە ٤ ساڵی ١٩٧٥ ل٨٣.

[2] - بڕیاری دادگای پیاچوونەوەی عێراقی ژمارە ٦٧٣ /دەستەی گشتی/١٩٧٩ لە ١٩٨٠/٥/١٠.

[3] - بڕیاری دادگای پیاچوونەوەی عێراقی ژمارە ٢٠٩ /کەسایەتی/١٩٨٠ لە ١٩٨٠/٧/٢٠ مجلة الاحكام العدلية ژمارە ٣١ ساڵی ١٩٨٠ ل٥٦٧.

[4] - بڕیاری دادگای پیاچوونەوەی عێراقی ژمارە٢٧٦ /دەستەی گشتی/١٩٨٠ لە ١٩٨٠/٥/١٢.

سەبارەت بە هەردوو حاڵەتی سەرەوە لە دەقی مادده/٢١ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((ژنەکە هەموو مارەییە دیاریکراوەکەی دەدرێتێ دوای جووتبوون یا مردنی یەکێك لە هاوسەرەکان، ئەگەر پێش جووتبوون تەڵاق بدرێت نیوەی مارەییە دیاریکراوەکەی پێ بدرێت)). هەروەها لە مادده/٢٢ی هەمان یاسادا هاتووە: ((ئەگەر لێك جیابوونەوە دوای جووتبوون لە گرێبەستێکی هاوسەرگیری نادروست ڕوویداو مارەییەکەشی دیاری کرابوو، ئەوا کەمترین مارەیی لە مارەییە دیاریکراوو مارەیی هاوچەشن وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر مارەییەکە دیاری نەکرابوو، ئەوکاتە مارەیی هاوچەشن وەردەگیرێت)).

**دووەم: بژێو (النفقة)**

بەو بەرامبەرە دەوترێ بژێو کە مرۆڤ دەیداتە ژنەکەی وەیان ئەو خزم‌و کەسەی کە بەخێوی دەکات.

هاوسەرگیری هۆکاری پێ بژاردنی بژێوی ژنە هەروەکو چۆن خزمایەتی‌و پەیوەندی خوێن هۆکاری پێ بژاردنی بژێوی دایك‌و باوك‌و منالآنە.

بەم پێیە، ئەگەرهاتوو ژنەکە مەرجەکانی هاوسەرێتی تیابوو وەك مەرجی ڕاستی‌و دروستیی گرێبەستەکە، هەروەها دەستدانی ژنەکە بۆ هامووشۆی ژن‌و مێردایەتی (المعاشرة الزوجية) ئەوا مافی بژێوی دەکەوێتە سەر مێردەکەی.

بژێوەکە خواردن‌و جل‌و بەرگ‌وپێداویستیەکانی نیشتەنی‌و نیشتەجێبوون‌و داوو دەرمان‌و کرێی پزیشك دەگرێتەوە، گرینگیش نیە ژنەکە لە ماڵی باوکی بێ یان لە

[1] -خوای گەورە لە سوورەتی بەقەرە لە ئایەتی ٢٣٧دا دەفەرمووێ: ((وان تلقتموهن قبل ان تمسوهن وقد فرضتم لهن فريضة فنصف مافرضتم)).

ماڵی مێردەکەی، چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا ئەم مافەی دەکەوێ، تەنیا ئەوکاتە نەبێ کە لەماڵی کەسو کاری بێو سەرەڕای داوای مێردەکەی بۆ گەڕانەوەی بۆ ماڵی خۆی نەگەڕێتەوەو بە ناهەق فەرمانەکە جێ بەجێ نەکات.

ئەگەرهاتوو هۆی جێ بەجێ نەکردنەکە ئەوەبێ کە پیاوەکەی مارەیی پێشینەی نەدابیتێ وەیان لە بژێوەکەی کەمتەرخەمی کردبێ ئەوا جێ بەجێ کردنەکە بە هەق لەقەڵەم دەدرێو بژێوی ژنەکە دەبێتە قەرز لە ئەستۆی مێردەکەی لەو کاتەوە کە مێردەکەی سەرپێچی دەکا لە بژاردنی بژێوەکە تا ئەوکاتەی ژنەکە داوای دەکا.

یاسادانەری عێراقی بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی بژێوی ژن داوە، بۆیە لە مادده/٣١ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا ڕێگای بە دادوەر داوە کە لە خۆیەوەو بەبێ داوای ژنەکە لەکاتی سەیرکردنی داوای بژێویدا بڕیاری تەرخانکردنی بژێوێکی کاتی بۆ ژنەکە بدا بە چەشنێك کە ئەم بڕیارە توانای جێبەجێکردنی هەبێ.

لەمەش گرینگتر، دانانی سندووقێکە بەناوی (سندووقی بژێوی کاتی)[1] کە لە ڕێگەی بوودجەی گشتی وڵاتەوە پارەی بۆ تەرخان دەکرێ، ئەم سندووقە بە ئەرکی تەسلیفکردنی بژێوی کاتی بۆ ئەو کەسانە هەڵدەستێ کە بڕیاریان بۆ ئەم مەبەستە بۆ دەرچووە.

سەبارەت بە بژێوی ژن لەسەر مێردەکەی، لە مادده/٢٣ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((١- بژێوی ژن لەسەر مێردەکەیەتی هەر لە کاتی بەستنی گرێبەستی دروستەوە، هەتا ئەگەر ژنەکە لەماڵی باوکیشی نیشتەجێ

---

[1] -بڕوانە بڕیاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ژمارە ٢٥٣ ی ١٩٨٠/٢/١٨ کە لە ڕۆژنامەی (الوقائع العراقیە) ژمارە ٢٧٥٨ ڕۆژی ١٩٨٠/٢/٢٥ بڵاوکراوەتەوە.

**بووبێت، تەنیا ئەگەر مێردەکەی داوای گەڕانەوەی بۆ ماڵی خۆی لێ بکاتو ژنەکەش بە ناڕەوایی نەگەڕێتەوە.**

**٢- نەگەڕانەوەی ژنەکە بە ڕەوا دادەنرێت مادامەکێ مێردەکەی مارەییە پێشینەکەی نەداتەوە یان خەرجیی نەکێشێ)).**

**بژێو ئەرکێکە لەسەر شانی مێرد بۆ بەرژەوەندی ژنەکەی بەپێی قورئانی پیرۆز، هەروەها ڕەفتاری پێغەمبەر (السنة النبوية) (د.خ) و بیروڕای سەرجەم یاسازانانی موسڵمان (الاجماع) و ئەقڵ، هەروەها یاسا.**

**خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:** ((وَعَلَى المَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالمَعْرُوفِ لا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلاَّ وُسْعَهَا))[1] **واتە بۆکەسێ منالّی بۆ لەدایك بوو، پێویستە خۆراكو پۆشاکی دایك بە جۆرێکی شیاو بدا، وە هیچ کەسێ لە توانای خۆی بەدەر تەکلیفی لێ ناکرێ.**

**هەروەها دەفەرموێ:** ((أَسْكِنُوهُنَّ مِن حَيْثُ سَكَنْتُم مِن وَجْدِكُم وَلا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاَتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ))[2] **واتە لە هەرکوێ خۆتان ئەژین بە ئەندازەی توانایی خۆتان جێو ژیانیان بدەنێ، وە بە زۆر بۆ هێنان زیانیان پێ مەگەیەنن کە بکەونە تەنگانەو ئەگەر دووگیان بوون بژێویان بدەنێ تا گیانەکەیان دائەنێت.**

**هەروەها دەفەرموێ:** ((لِيُنْفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ وَمَن قُدِرَ عَلِيْهِ رِزْقُهُ فَلَيُنْفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ))[3] **واتە با دەوڵەمەند بەشێوەی دەوڵەمەندی خۆی بژێو بدا بە کەسێ کە**

---

[1] -سورەتی بەقەرە ئایەتی ٢٣٣.

[2] -سورەتی تەلاّق ئایەتی ٦.

[3] - سورەتی تەلاّق ئایەتی ٧.

دەست کورت بێ، لەوەی کە خوا پێی داوە، خوا تەکلیف لە کەسێ ناکا، مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی خوا بۆی داوە.

هەروەها لە ڕەفتارەکانی پێغەمبەریشدا ئەم مافەی ژن سەلمێندراوە، لەوانە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) : ((ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف))[1] واتە خۆراکو پۆشاکیان بە جۆرێکی شیاو دەکەوێتە سەر ئەستۆی ئێوە. مەبەستی پێغەمبەر (د.خ) لەم فەرموودەیەدا ئەوەیە کە ژنان خۆراکو پۆشاکیان بەشێوەیەکی شیاو دەکەوێتە سەر ئەستۆی مێردەکانیان.

ئەمەو بە درێژایی چاخەکان یاسازانان لەسەر ئەوە کۆك بوونە کە بژێوی ژن لەسەر مێردەکەیەتی بێ ئەوەی کەسێك هەبێ بیروڕای لەمبارەیەوە جیابێ. هەروەها ئەمەش لەگەڵ حوکمی ئەقڵ دەگونجێ چونکە ئەرکی ژن بایەخ دانە بە کاروباری ماڵەوەو سەرپەرشتیکردنو پەروەردەکردنی منالآن بۆیە دەبێ بژێویەکەی لەسەر مێردەکەی بێت. لەچوار خاڵدا باس لە بژێوی ژن دەکەین لەگەڵ کاتی دەستپێکردنو مەرجەکانی، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١_بنچینەی خەملآندنی بژێو.

٢_زیادکردنو کەمکردنەوەی بژێو.

٣_ ڕێگاپێدانی دادوەر بە ژن بۆئەوەی قەرز بکات.

٤– ڕێگاپێدانی دادوەر بە ژن بۆئەوەی قەرز بکات هەروەها حوکمی بۆ دەربکات بە بڕینەوەی بژێوێکی کاتی.

٥_ حوکمی قەرزی بژێو (حكم دين النفقة).

---

[1] - نظام الدين عبد الحميد: احكام الاسرة في الفقه الاسلامي، سەرچاوەی پێشوو ل١٧٦.

**١- ئەوشتانەی بژێو دەیانگرێتەوە لەگەڵ کاتی دەستپێکردنو مەرجەکانی لە خوارەوە لەسێ خاڵدا باسیان دەکەین:**

**أ- ئەوشتانەی بژێو دەیانگرێتەوە:**

بەپێی برگەی دوو لە مادده/٢٤ ی یاسای باری کەسیی عێراقی ژمارە ١٨٨ ی ساڵی ١٩٥٩ هەموارکراو بژێوو خواردن و جلو بەرگو پۆشاکو جێگای حەوانەوەو پێداویستیەکانیو کرێی چارەسەرکردن لە نەخۆشیو خزمەتکردنی ژنەکە بەقەدەر هاوچەشنەکەی دەگرێتەوە.

سەبارەت بەمە، لە برگەی ناوبراو لە ماددەی ناوبراودا هاتووە: ((بژێو ئەوانە دەگرێتەوە: خواردنو پۆشاکو جێگای حەوانەوەو پێداویستیەکانی ناوماڵو کرێی چارەسەرکردن لە نەخۆشی بەو پێوانەیەی کە ناسراوەو خزمەتی ژنەکە بەقەد هاوچەشنەکەی دیاریکراوە)).

هیچ گومانی تیا نیە، ئەم بژێوانەی سەرەوە کە مافی ژنن لەگەڵ پێداویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی ژن دەگونجێن.

**لە دەقی ئەم ماددەیەدا بۆمان بەدیاردەکەوێ کە بژێوی ژن ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:**

**١-خواردنو خواردنەوەو خۆراك**

لەڕاستیدا، بڕی خواردنو خواردنەوەو خۆراك خۆی لە خۆیدا دیاری نەکراوە، بەڵکو دەبێ ئەو بڕە بێت کە ژیانی ژنەکە زامن بکات.

**٢-پۆشاك (الكسوة)**

بریتیە لەو جلو بەرگو پۆشاکەی کە ژنەکە پێویستی پێی هەیە بە مەرجێك لەگەڵ توانای دارایی هاوسەرەکەو شوێنی لەنێو کۆمەڵدا بگونجێ.

بۆ ئەم مەبەستەش پشت بە دابو نەریتی کۆمەلأیەتی دەبەسترێ.

**٣-شوێنی حەوانەوە (المسكن)**

دەبێ شوێنێکی وەهابێت حەوانەوەی ژنەکەی تیا دابین بێتو لەگەڵ باری دارایی‌و کۆمەلأیەتی هاوسەرەکەی بگونجێت.

**٤-کرێی نوشدارو داوو دەرمان**

بڕی ئەم کرێیەش بەو گوێرەیە دەبێ کە باوە لەناو کۆمەڵدا.

**٥-خزمەتکردنی ژنەکە ئەگەر ئەو کەسانەی هاوچەشنی ئەون خزمەتکاریان هەبێت.** ئەم مافەی لەو حاڵەتەدا دەبێت، ئەگەرهاتوو، ژنەکە بەرلە ئەوکەسانەی وەکو ئەون خزمەتکاریان هەبێت.

**ب-کاتی دەستپێکردنی بژێو**

لە دەقی بڕگەی یەکی ماددە/٢٣ ی یاسای باری کەسیدا هاتووە: ((بژێوی ژن لەسەر مێردەکەیەتی هەر لەکاتی بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیری دروستەوە...)).

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە کاتی دەستپێکردنی بژێوەکە هاوشانە (متزامن) لەگەڵ کاتی بەستنی گرێبەستەکە ئەگەرهاتوو بەستنی گرێبەستەکە دروست بێت. جا لێرەدا گرینگ نیە ژنەکە لە ماڵی خۆی نیشتەجێ بووبێت یان لە ماڵی کەس‌وکاری، مەگەر مێردەکەی داوای لێ کردبێت کە بگەڕێتەوە ماڵی خۆی‌و ئەویش داواکەی ڕەتکردبێتەوە، لەو حاڵەتەدا مافی بژێوی نابێت.

**ج- مەرجەکانی بژێو**

ژن مافی بژێوی دەکەوێتەسەر مێردەکەی ئەگەرهاتوو ئـەم مەرجانـەی خـوارەوەی هەبێت.

أ–بوونی گرێبەستێکی دروست بەپێی یاساو شـەرع. کەواتـە بـەپێی گرێبەسـتێکی پووچەڵ یان پێچەوانەی یاساو شەرع مافی بژێوی نابێت.

ب–دەبــێ ژنەکــە دەســت بــدات بــۆ جووتبــوونو بــەدیهێنانی ئامانجــەکانی هاوسەرگیری، چونکە ئەم مافە بەرامبەر ئەم ئەرکەیە.

ج–نابێ ژنەکە ناچیزە بێت. ناچیزەبوون بـەو حاڵەتـە دەوتـرێ کـە ژن گوێڕایـەڵی مێردەکەی نەبێت لەو کاروبارانەی کە خوا بە ئەرکی سەرشانی ژنەکـەی دانـاوە بەرامبەر بـە مێردەکـەی. بۆنموونـە، ئەگـەرهاتوو دوای بەسـتنی گرێبەسـتێکی دروست نەچووە ماڵی مێردەکەی سەرەڕای بانگێشکردنی لەلایەن ئەوەوە، لـەم حاڵەتەدا ژنەکە بە ناچیزە دادەندرێتو مافی بژێوی نابێت.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بۆئەوەی ژنەکە لەم حاڵەتەی سـەرەوەدا بـە ناچـیزە دابندرێت، دەبێ مێردەکەی شوێنێکی حەوانەوەی شـەرعی بـۆ دابـین کردبێـت کـە گشت مەرجەکانی حەوانەوەی تیابێت[1].

## ٢– بنچینەی خەملاندنی بژێو

لــە دەقــی مــاددە/٢٧ ی یاســای بــاری کەســیدا هــاتووە: ((بــژێوی ژن لەســەر مێردەکــەی بــەپێی بــاری دارایــی هــەردووکیان (بــە هــەبوونو بــە نــەبوون) دەخەملێندرێت)).

[1] -د.عبد الرحمن الصابوني: شرح قانون الاحوال الشخصية السوري –في الزواج واطلاق، ط٥، سنة ١٩٧٩ل٣٠٥.

بەپێی ئەم دەقە، باری دارایی هەردوو هاوسەرەکە لەبەرچاو دەگیرێت، ئەگەرهاتوو هەردوو هاوسەرەکە هەبوو بوون، ئەوا ئەو بژێوەی بۆ ژنەکە دیار دەکرێت دەبێ بژێوی هەبووان بێت، وە ئەگەر هاتوو لە نەبووان بوون ئەوا بژێوەکە بژێوی نەبووان دەبێت، وە ئەگەر هاتوو یەکێکیان هەبوو بوو، وە ئەوەی تریش نەبوو بوو، ئەوکاتە بژێوەکە مام ناوەندی دەبێت لە نێوان هەبوونو نەبووندا.

هەر لەمبارەیەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ((لا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ مَا آتَاهَا))[1] واتە: ((خوا تەکلیف لە کەس ناکات، مەگەر بە ئەندازەی ئەوەی خوا بۆی داناوە)).

بەم پێیە، ئەگەرهاتوو خەملاندنی بژێوەکە مێردەکەی خستە تەنگژەوە، ئەگەرهاتوو نەبوو بوو و بڕی ئەم بژێوەی بۆ ژنەکەی بڕاوەتەوە لە توانای ئەو زیاتر بوو، ئەوکاتە بەپێی توانای دارایی خۆی بژێوەکەی بۆ خەرج دەکاتو بڕە زیادەکەی تریش دەبێتە قەرز لەسەری تا ئەو کاتەی هەبوو دەبێت.

### ٣- زیادکردنو کەمکردنەوەی بژێو

ئەگەرهاتوو باری دارایی مێردەکە گۆڕانی بەسەرداهات بە هەبوونیو بە نەبوونی یان گۆڕان بەسەر نرخەکان داهات، ئەوکاتە دادوەر بۆی هەیە لەسەر داوای یەکێك لە هاوسەرەکان بژێوەکە بگۆڕێ بە چەشنێك لەگەڵ بارودۆخە نوێ یەکە بگونجێت[2]. سەبارەت بەمە لە مادده/ ٢٨ی یاسای باری کەسیدا هاتووە: ((١-

[1] - سورەتی تەلاق ئایەتی (٧).

[2] -د.احمد علي والاخرون: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل١١٩.

زیادکردنـەوەو کەمکردنـەوەی بـژێوی ژنەکـە، بـە گـۆڕانی بـاری دارایـی هـەردوو هاوسەرەکەو نرخەکانی ولاّت دەگۆڕێت.

٣- لەکاتی سەرهەڵدانی ڕووداوی ناکاودا، پێویستی بەوە کرد کە گۆڕانکاری لـە بژێوی سەپاو بکرێـت، دەکـرێ داواکـاری کەمکردنـەوە یـا زیـادکردنی بژێوەکـە بەرزبکرێتەوەو دادگاش وەریدەگرێت)).

٤-ڕێگاپێدانی دادوەر بە ژن بۆئەوەی قەرز بکات هەروەها حوکمی بۆ دەربکات بە بڕینەوەی بژێوێکی کاتی.

### أ- ڕێگاپێدانی دادوەر بە ژن بۆئەوەی قەرز بکات:

لە دەقـی مـاددە/٢٩ی یاسـای بـاری کەسـیی عێراقیـدا هـاتووە: ((ئەگـەر مێردێك ژنەکەی خۆی بەبێ خەرجی جێهێشتو بزربوو یا ون بوو یـا بـێ سەروشـوێن بـوو، دادوەر بڕیاری بژێوی ژنەکە لە ڕێکەوتی بەرزکردنەوەی داواکاریەکـەوە دەردەکـات دوای سەلماندنی ژنو مێردایەتیانو سوێنددانی ژنەکە، کەوا مێردەکەی خەرجی بۆ بەجێ نەهێشتووەو ژنەکە ناچیزە نیەو تەلاّق نەدراوەو عیددەشی بەسەرچـووبێت. ئەوکات دادوەر ڕەزامەندی لەسەر قەرزوەرگرتنی پـارە لەلایـەن ژنەکـەوەو بـەناوی مێردەکەی لە حاڵەتی پێویستی دەدات)).

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ ئەگەر مێردێك ژنەکەی خۆی بـەبێ خـەرجی بـەجێ بهێڵێ، دادوەر بڕیاری بژێو بڕینەوەی بـۆ دەردەکـات لـە ڕێکـەوتی بەرزکردنـەوەی داواکاریەکەی، هەروەها دادوەر ڕێگای پێ دەدات کە بـە نـاوی مێردەکـەی قـەرزی بکات لەکاتی پێویستیدا.

هەروەها لە ماددە/٣٠ دا هاتووە: ((ئەگەر ژنەکە دەستکورت بوو و ڕێگای قەرزکردنی پێ درابێت، بەپێی ماددەی پێشوو، ئەگەر کەسێك هەبوو خەرجی بداتێ (بەدەر لە مێردەکەی) پێویستە لەکاتی داوای ژنەکە پارەو پوولی بەقەرز بداتێ، ئەگەر لە توانایدا بێتو مافی گەڕانەوەی تەنیا لەسەر مێردەکە هەیە. بەڵام ئەگەر لە کەسێکی بیانی قەرزکرد، خاوەن قەرز سەرپشکە لە داواکردنەوە لە ژنەکە یا مێردەکەی. ئەگەر کەس نەبوو بە قەرزی بداتێو نەشیدەتوانی کارێك بکات، پێویستە دەوڵەت خەرجی بکێشێت)).

حوکمی ئەم دەقە ئەوەیە، ئەگەر ژنەکە کەسێکی شك برد لەوانەی مافی بژێوی لەسەریانە بێ لە مێردەکەی وەك باوكو برای کە میراتگری ئەون، چونکە ئەمانە میراتی لێ دەگرن، بۆیە ناچارن بژێوی بکێشن ئەگەر توانای داراییان باش بێت.

لەو حاڵەتەدا بۆیان هەیە لەکاتی گەڕانەوەو بەدەرکەوتنەوەی مێردەکە بگەڕێنەوە سەریو داوای قەرزەکەی لێ بکەنەوە، بەڵام بۆیان نیە داوا لە ژنەکەی بکەن.

بەڵام ئەگەرهاتوو ژنەکە پارەی لە کەسانێکی بێگانە قەرزکرد، ئەوکاتە ئەو بێگانەیە بۆی هەیە بگەڕێتەوەسەر مێردی ژنەکە یان ژنەکە، بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکەی، چونکە میراتگری ژنەکە نینو ئەرکی بژێوی ئەویان لە ئەستۆ نیە.

وە ئەگەر ژنەکە کەسێکی دەست نەکەوت پارەی لێ قەرز بکات، چ لە خزمو چ لە بێگانەو توانای کارکردنیشی نەبوو، ئەوکاتە دەوڵەت ئەرکی بژێویەکەی دەخاتە ئەستۆی خۆیو لە سندووقی بژێوی کاتی پارەی بۆ خەرج دەکات.

### ب–بڕیاری دادگا بە بڕینەوەی بژێوی کاتی:

لە دەقی مادده/ ٣١ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((١- دادوەر بۆی هەیە، لەکاتی سەیرکردنی داوای بژێوی، بڕیاری تەرخانکردنی بژێوێکی کاتی بۆ ژنەکە بدات، لەسەر حسابی مێردەکەیو ئەم بڕیارەش شیاو دەبێت بۆ جێبەجێ کردن.

٣- ئەم بڕیارە پاشکۆی ئاکامی حوکمی بنەڕەتی داواکەیە، لە ڕوانگەی حسابکردنی بژێوەکە یا ڕەتکردنەوەی داواکە)).

مەبەستی یاسادانەری عێراقی لەم دەقەدا ئەوەیە، ژیانی ژن دابین بکات لە حاڵەتێکدا، ئەگەرهاتوو دادبینییەکە زۆری خایاندو کێشە بنەڕەتیەکە بەزوویی یەکلا نەبۆوە. بۆیە ڕێگای بە دادوەر داوە بە بڕیارێك بژێوی کاتی بۆ ببڕێتەوە لەسەر حیسابی مێردەکەی وە ئەم بڕیارەش شیاوی جێبەجێکردن دەبێت. هەروەها دەبێتە پاشکۆی ئاکامی حوکمی بنەڕەتی داوایەکە.

## ٤- حوکمی قەرزی بژێو (حكم دين النفقة)

بژێوی ژن قەرزە لەسەر مێردەکەی لەو کاتەوەی کە خۆی پێی هەڵناستێ سەرەڕای دەرنەچوونی بڕیار لەلایەن دادوەرەوە، یان ڕیك نەکەوتنی هاوسەرەکان لەسەر بڕەکەی.

ئەم قەرزە زۆر بەهێزە، تەنها بە جێبەجێکردن یان گەردەن ئازاکردن نامێنێ. بۆیە ئەو بژێوەی لەسەر ئەستۆی مێردەکە کۆبۆتەوە لە حاڵەتی تەلاقو مردنیشدا هەر دەمێنێو ناسووتێ.

## ٥- ژەم پێدانو دایەنخانە

ژەمپێدان (الرضاع) بە کرداری مژینی شیری دایك یان هەر ژنێك لە ڕێگای مەمکەکانیەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەگوترێ. بەپێی شەرعو یاسا دەبێ دایك شیری خۆی بداتە منداڵەکەی تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ کە لەبەر نەخۆشی ئەوەی پێ ئەنجام نەدرێ هەروەکو لە ماددەی (٥٥)ی یاسای باری کەسی عیراقی کارپێکراودا هاتووەو دەڵێ: ((دەبێ دایك شیری منداڵەکەی بدات تەنها لە حاڵەتی نەخۆشیدا نەبێت کە ڕێگای ئەم کارەی لێ دەگرێت))، بەپێی شەرع ماوەی شیرپێدانی تەواو دوو ساڵە بە بەڵگەی ئایەتی (٢٣٣) لە سوورەتی بەقەرە لە قورئانی پیرۆز کە تیایدا هاتووە: (( وَالوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ)). واتە دەبێ هەموو دایکێك دوو ساڵی تەواو شیری منداڵەکەی بدات، ئەو کەسەی بیەوێ شیرپێدانەکەی بێ کەموکوڕی بێت.

کرێی شیرپێدان دەکەوێتە ئەستۆی باوك چونکە بژێوی منداڵ ئەرکی سەرشانی باوك یان ئەو کەسەیە کە بژێوی منداڵەکەی لە ئەستۆیە لەبەرئەوەی کرێی شیرپێدانیش بەشێکە لە پێداویستییە سەرەکییەکانی منداڵ بۆیە کرێی ئەم شیرپێدانە دەکەوێتە ئەستۆی باوك یان ئەو کەسەی بژێوی منداڵەکەی لە ئەستۆدایە هەروەکو لە ماددەی (٥٦) ی یاسای ناوبراودا هاتووەو دەڵێ : ((کرێی ژەمپێدانی منداڵ لە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە ئەرکی بژێوی منداڵەکەی پێ ڕاسپێردراوە، ئەم کرێیەش لە بڕی خۆراکەکەیەتی)).

دایك لە هەموو کەسێك بۆ دایەنێتی منداڵەکەی باشترە بۆیە لە کاتی پەیوەندیی هاوسەریداو دوای ئەم پەیوەندییەش لەکاتی دەستلێکبەرداندا مافی پەروەردەکردنو شیرپێدانی منداڵەکەی هەیە، ئەم مافەش لەبڕی ئەو خۆراکە دێت کە دایکەکە لە ڕێگای مەمکەکانیەوە دەیداتە منداڵەکەی.

پێویستە ئەو ژنەی دایەنی منداڵە ساواکەی دەکەوێتە ئەستۆ لێهاتوو (بالغ) بێت واتە تەمەنی لە هەژدە ساڵ کەمتر نەبێت بەپێی یاسای عیراقی، هەروەها ئاقڵو دەست پاکو بە توانا بێت لە پەروەردەکردنو ئاگالێبوونی بە دایەن دراوەکە وە نابێت مێردی بە بێگانە کردبێتەوە.

واتە ئەگەر مێردی بە خزمێکی منداڵەکە کردەوە، ئەم مێردکردنەوەیە ڕێگا لەبەردەم مافی دایەنێتیەکەی ناگرێت، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەو مێردە بەگوێرەی بەدایەندراوەکە بێگانە بوو ئەوا دەبێتە کۆسپێك لەبەردەم ئەم مافەداو ڕێگای سوودوەرگرتنی لەم مافە لێ دەگیرێت، هەروەکو لە ماددەی (٥٧)ی یاسای ناوبراودا هاتووەو دەڵێ: ((١-دایك لە هەموو کەسێك زیاتر مافی پەروەردەکردنو دایەنێتیی منداڵەکەی هەیە لەکاتی هاوسەریداو دوای لێکجیابوونەوە ئەگەرهاتوو بە دایەندراوەکە زیانی پێ نەگات.

٢-دەبێ دایەنەکە لێهاتوو وئاقڵو دەستپاکو بە توانا بێت لە پەروەردەکردنو پاراستنی بە دایەندراوەکەو نابێت مێردی بە بێگانەیەك بەگوێرەی بە دایەندراوەکە کردبێتەوە)).

سەبارەت بە حوکمی قەرزی بژێو، یاسادانەری عێراقی لە بڕگەی یەکەمی ماددە/٢٤ ی یاسای باری کەسیدا دەڵێ: ((بژێوی ژنی ناچیزە، قەرزە لە ئەستۆی مێردەکەی هەر لە کاتی نەدانی خەرجیەکەوە)).

هەروەها لەماددە/٣٢ی یاسای ناوبراودا هاتووە: ((بڕی بژێوە نەدراوەکە، بە تەڵاقدان یا بە مردنی یەك لە هاوسەرەکان، ناسووتێ)).

**سێیەم: مامەڵەکردن بەشێوەیەکی باشو دادپەروەرانە**

یەکێکی تر لە مافەکانی ژن، مافی مامەڵەکردنە بەشێوەیەکی باشو دادپەروەرانە. هەرچەندە یاسای باری کەسی ئاماژەی بەم مافە نەکردووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم مافەی نەبێت، چونکە شەریعەتی ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە، وە لەبەرئەوەی بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکیە لە سەرچاوەکانی یاسای باری کەسیی عێراقی هەروەکو لە دەقی بڕگە دووی مادده/١ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((ئەگەر دەقێکی دانراو بۆ پیادەکردن نەبوو، پێویستە پشت بە گونجاوترین بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلام کە زیاتر لەگەڵ دەقەکانی ئەم یاسایەدا دەگونجێت ببەسترێت)). بۆیە بۆ حوکمی ئەم حاڵەتە دەگەڕێینەوە سەر بنچینەکانی شەریعەتی ئیسلام.

شایەنی ئاماژەیە، خوای گەورە لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٩) دا سەبارەت بە مامەڵەکردنی ژن بەشێوەیەکی باشو دادپەروەرانە دەفەرموێ: ((وَعَاشِرُوهُنَّ بِالمَعْرُوفِ)) واتە بەچاکیو شیاوی مامەڵەیان لەگەڵ بکەن. ئەمەش مانای ئەوەیە، دەبێ پیاو قسەو گوفتارو کردارو هەڵسو کەوتی چاك بێت لەگەڵ ژنەکەی.

**ب- مافەکانی پیاو**

لەبەرامبەر ئەو مافانەی کە ژن لەسەر مێردەکەی هەیەتی، پیاویش هەندێك مافی لەسەر ژنەکەیەتی کە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: گوێڕایەڵی**

دەبێ ژن گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت، چونکە ئەو سەرۆکی خێزانەو ئەرکی بەڕێوەبردنو ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی خێزانی لە ئەستۆدایە.

سەبارەت بە گوێڕایەڵی ژن بۆ مێردەکەی، خوای گەورە لە سورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٢٨) دەفەرموێ: ((وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ)) واتە ژنان مافیان لەسەر پیاوان هەیە، هەروەها کە پیاوان لەسەر ژنانیان هەیە، بەڵام بۆ پیاوان پلەیەك مافی زیاتر هەیە.

**دووەم: مانەوە لە ماڵەوە**

دەبێ ژن لەگەڵ مێردەکەی لە ماڵەوە بمێنێتەوە، ئەگەرهاتوو مێردەکەی ماڵی بۆ داناو مارەییە پێشینەکەشی دایە.

ئەمەش خۆی لەخۆیدا، لەگەڵ پێداویستیەکانی ژیانی هاوسەرێتی دەگونجێ، کە یەکێك لە ئامانجەکانی هاوسەرێتی لەدایکبوونو پەروەردەکردنی مناڵە.

بۆیە مێرد بۆی هەیە لێنەگەڕێت ژنەکەی بەبێ ڕەزامەندی ئەو بچێتە دەرەوە تەنها لە حاڵەتی پێویستیدا نەبێت.

سەبارەت بە مانەوەی ژن لە ماڵی مێردەکەی، خوای گەورە لە سورەتی (الاحزاب) ئایەتی (٣٣)دا دەفەرموێ: ((وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلا تَبَرَّجْنَ تَبُرُّجَ الجَاهِلِيَّةِ الأُولى)) واتە لە ماڵی خۆتاندا بمێننەوەو هەروەکو پێشاندانی جاهیلییەی یەکەم لەنێو خەڵکدا جوانی خۆتان دەرمەخەن.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ئەگەر ژنەکە ویستی کاربکات، مێردەکەی نابێت لە چوونە دەرەوە قەدەغەی بکات، ئەگەرهاتوو نەبێتە مایەی زیانگەیاندن پێی. چونکە هەروەکو دەزانین هەموو کەسێك چ نێرینە یان مێیینە مافی کارکردنیان هەیە، بۆیە

نابێ ئـەم مافـەی بەشـێوەیەکی نـاڕەوا لێ زەوت بکرێـت کـە یاسـا پێـی بەخشـیوەو کەفالەتیشی دەکات، مەگەر مێردەکە پاساوی بەجێی بەدەستەوە بێت.

هەروەها سەبارەت بە مافەکانی تر وەك مافی خوێنـدن چـونکە پرۆسـەکردنی ئـەم مافانـە، خـۆی لەخۆیـدا چـونەدەرەوە لـە ماڵـەوە دەخوازێـت‌و قەدەغەکردنیشـی دەبێتە مایەی پرۆسەنەکردنی، وە ئەمەش پێچەوانەی حوکمی یاسایە.

## سێیەم: تەمبێ کردن (التأديب)

هەروەکو پێش ئێستا باسمان کرد، دەبێ ژن گوێڕایەڵی مێردەکەی بێت، جا ئەگەر هاتوو، گوێڕایەڵی نەبوو، مێردەکە بۆی هەیە تەمبێی بکات.

لە هەقیقەتدا، ئەم مافەی پیاو دەگەڕێتەوە بۆ حـوکمی قورئـانی پـیرۆز کـە خـوای گەورە لە سورەتی (النساء) لە ئایەتی (٣٤)دا دەفـەرموێ: ((الرِّجَـالُ قَوَّامُـونَ عَلَـى النِّسَاءِ)) واتە پیاوان کارسازو سەرپەرشتی ژنانن.

هـەروەها تیایـدا هـاتووە: ((وَاللاَّتِـي تَخَـافُونَ نُشُـوزَهُنَّ فَعِظُـوهُنَّ وَاهْجُـرُوهُنَّ فِـي المَضَـاجِعِ وَاضْـرِبُوهُنَّ فَـإِنْ أَطَعْـنَكُمْ فَـلا تَبْغُـوا عَلَـيْهِنَّ سَـبِيلاً)) واتــە ژنانــێ کــە بەرزەفڕن‌و ئەترسن کەنافەرمانیتان بکـەن، لەبـەرا ئامۆژگارییـان بکـەن، لـە پلـەی دووەمدا جێیان لێ جیابکەنەوە، جا لەپلەی سێیەمدا لێیان بدەن‌و تەمبێیان بکەن، بەڵام ئەگەر بە قسەیان نەکردن، ئێـوەش بیانویـان پـێ مـەگرن‌و ڕێـی سـتەمکردن لەوان مەگرنەبەر.

بەپێی حوکمی ئەم ئایەتە، پیاو بۆی هەیە بە شێوازێك لەم شـێوازانەی خـوارەوە، ژنەکەی تەمبێ بکات، ئەگەرهاتوو گوێڕایەڵی نەبوو و لاسار بوو:

## أ–ئامۆژگاری

ئەگەرهاتوو ژن گوێڕایەڵیی مێردەکەی نەکرد، مێردەکەی بۆی هەیە ئامۆژگاری بکات. ئەمەش بە لێك حاڵیبوونو لەیەك گەیشتن دەبێت. بۆ ئەم مەبەستە مێردەکە ئەرکەکان دەخاتەوە بیری ژنەکەیو ڕاستیەکانی تێدەگەیەنێتو ڕێگای ڕاستی نیشان دەداتو تێی دەگەیەنێ کە سووربوونی ژنەکەی لەسەر ئەو ڕەفتارانەی ئاکامی باش نابێت.

## ب–جیاکردنەوەی جێگای خەوتن

ئەگەرهاتوو، ئامۆژگاری ئاکامی باشی نەبوو، ئەوکاتە مێردەکە پەنا دەباتە بەر شێوازی دووەم، کە بریتییە لە جیاکردنەوەی جێگای خەوتن.

بەم پێیە، مێردەکە جێگای خەوتن لە ژنەکەی جیا دەکاتەوە بۆ ماوەیەك کە نابێت لە چوار مانگ زیاتر بێت[1].

## ج–لێدانو تەمبێکردن

ئەگەرهاتوو، بەکارهێنانی شێوازی پێشوو، ئاکامی باشی نەبوو، ئەوکاتە، مێردەکە بۆی هەیە ئەم ڕێگایە بگرێتەبەر. ئەویش لێدانو تەمبێکردنی ژنەکەیە، بەڵام نابێ پەنا ببردرێتەبەر ئەم شێوازە تەنها لە حاڵەتی پێویستیدا نەبێتن هەروەها نابێتئێشو ئازار بە ژنەکە بگەیەنێت.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، پەرلەمانی کوردستان بە یاسای ژمارە (٧)ی ساڵی ٢٠٠١ لەماددەی یەکەمیدا ئەم مافەی لە مێرد وەرگرتۆتەوەو ژنی لە حوکمەکانی بڕگە/١

---

[1] -د.احمد والاخرون: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل٩٨–٩٩.

ی ماددە/٤١ ی یاسای سزاکانی عیراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ ی هەموارکراو[١] ڕیزپەڕ کردووە کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((ماددەی یەکەم: ژن (الزوجة) لە حوکمەکانی بڕگە (١)ی ماددەی (٤١)ی یاسای سزاکانی ژمارە (١١١)ی هەموارکراوی ساڵی (١٩٦٩) هەڵدەبوێردرێ (تستثني) ))[٢].

**ج- مافە هاوبەشەکانی هەردوو هاوسەر**

هەردوو هاوسەر لە هەندێ مافدا هاوبەشن وەکو یەك کە ئەمانەی خوارەوەن:

**یەکەم: بەیەکەوەژیان**

هەردوو هاوسەر دەبێ ژیانێکی ئاسوودەو شادیو دوور لە ڕقو کینەو دوو بەرەکی لەگەڵ یەکتر بەرنەسەر، چونکە ژیانی هاوسەرێتی لەسەر بنەمای سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی هاتنەوە بەیەك دامەزراوە، بۆیە دەبێ هەریەکێك لە هاوسەرەکان کارێکی وا نەکات جێگای ناڕەزایی هاوسەرەکەی یان پێچەوانەی یاساو ڕێساو دابو نەریتی کۆمەڵایەتی بێت. وە دەبێ هەمیشە گیانی لێبووردنیان بەرامبەر یەك هەبێت.

**دووەم: جووتبوون لەگەڵ یەکتری**

خوای گەورەغەریزەی سێکسی بەخشیوە بە هەموو توخمێکی نێرینەو مێیینە، لەوانەش پیاوو ژن. هەر بۆیە، هەردوو هاوسەر، بەپێی گرێبەستی هاوسەرگیری مافی

---

[١] - ئەمەش دەقی ماددەی (٤١)ی یاسای سزاکان ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ هەموارکراوە: ((لاجريمة اذا وقع الفعل استعمالا لحق مقرر بمقتضى القانون ويعتبر استعمالا للحق: ١- تأديب زوجته وتأديب الاباء والمعلمين ومن في حكمهم الاولاد القصر في حدود ماهو مقرر شرعا او قانونا او عرفا....الخ)).

[٢] - بۆ دەقی ئەم یاسایە بڕوانە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان ژمارە (١٩) ساڵی ٢٠٠١/٨/١.

تێرکردنی غەریزەی سێکسییان لەسەر یەکتر هەیەو دەبێ هەریەکێك لە هاوسەرەکان غەریزەی سێکسیی ئەوەی تر تێربکات تەنها لە حاڵەتی بوونی بەربەستێکی شەرعیو یاسایی یان پاساوی ڕەوادا نەبێت وەك حاڵەتی نەخۆشیو بێنوێژی.

## سێیەم: ڕەچەڵەکی منداڵەکان

بەپێی گرێبەستی هاوسەرگیری ڕەچەڵەکی منداڵەکان بۆ هەردوو هاوسەر وەکویەك دەسەلمێندرێتو ژنەکە دەبێتە دایکیانو مێردەکەش دەبێتە باوکیان[١].

## چوارەم: میرات گرتن

بەپێی گرێبەستی هاوسەرگیری دروست، هەردوو هاوسەر مافی میرات گرتنیان لە یەکتری دەبێت.

سەبارەت بەم مافە لە دەقی برگەی /ب ماددە/٨٦ ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((هۆیەکانی میرات دوانن ئەوانیش خزمایەتیو هاوسەرێتی دروستە)).

---

[١] -نظام الدين عبد المجيد: احكام الاسرة في الفقه الاسلامي، سەرچاوەی پێشوو ل١٩٨.

## بژێوی دایك‌و باوك

ئەگــەر چــاوێك بــە فایلــەکانی دادگــا یــان دۆســیەکانی بەڕێوەبەرایــەتی جێبەجێکردن بخشێنین چەندین کێشەی تایبەت بە بژێوی دایك‌و باوك بەرچاو دەکەوێ.

لـە ڕاسـتیدا، ئـەم جـۆرە کێشـانە لـە ئاکـامی خراپـی بـاری گـوزەران‌و کـەم دەرامەتی دایکان‌و باوکان لە لایەکەوەو دەوڵەمەندی‌و هەبوویی منداڵەکانی ئەو دایك‌و باوکانە لەلایەکی ترەوە دێنە ئاراوە.

بۆیە ئەگەر ئەو کەسانە بە خۆشی‌و ڕەزامەندی خۆیان ئاوڕێك لە دایك‌و باوکیـان بدەنەوەو وەکو پێویست دەستی یارمەتیان بۆ درێژ نەکەن ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی هەندێك لەو دایك‌و باوکانە ڕوو لە دادگا بکەن بۆ بەرزکردنەوەی داوا لە دژی منداڵــەکانیان بەمەبەســتی بڕینــەوەی بــژێوێکی مانگانــە، ئەوکاتــە دادگــا دوای لێکۆڵینەوەو سەلماندنی داواکە بڕیارێك بۆ ئەم مەبەستە دەردەکات‌و بەڕێوەبەرێتی جێبەجێکردنیش (مديرية التنفيذ) ئەم بڕیارەی دادگا جێبەجێ دەکات.

شـایەنی ئاماژەبۆکردنـە، دادگـا لـە بڕیارەکەیـدا توانـای دارایـی منداڵـە داوا لەسەر تۆمارکراوەکەو پێویستیەکانی دایك‌و باوکە داواکارەکە لەبەرچاو دەگرێت، واتە هەرچەندی منداڵە داوالەسەر تۆمارکراوەکە باری دارایی باش بێت هێندە بڕی ئەو پارەیە زیاد دەبێت کە دادگا بۆ دایك‌و باوکە داواکارەکە دەیبڕێتەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانین ئاماژە بە مادده (٦١) ی یاسای باری کەسی عیراقی کارپێکراو بکەین کە تایبەتە بە ڕێکخستنی حوکمەکانی بژێوی دایكو باوك مەبەستمان لەمەدا ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسانەیە کە باری ئابووریان باشەو باری گوزەرانی دایكو باوکیشیان لەوپەڕی خراپی دایە تاوەکو ئاوڕیان لیٚ بدەنەوەو دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەن وە بە پێی توانا پێویستییەکانیان دابین بکەن چونکە بەپێی ئەم ماددەیە گشت دایكو باوکێك مافی دابینکردنی بژێوی لەسەر منالّەکانی هەیەبۆیە لەجیاتی ئەوەی لە ڕێگای دادگاوە ئەم کێشەیە چارەسەر بکریٚ باشتروایە ئارەزوومەندانە جێبەجیٚ بکرێت بەمەش پەیوەندییە پیرۆزەکەی خێزانو کۆمەڵ دەپارێزرێتو سەربەرزیو شکۆمەندیش بۆ ئەو کەسانە دەمێنێتەوە.ئەمەش دەقی ماددەی ناوبراوە: ((ئەو مندالّەی هەبووە (الموسر) جا چ گەورە بێت یان بچووك بژێوی دایكو باوکە کەمدەرامەتەکەی دەکەوێتە ئەستۆ هەرچەندە توانای وەدەستهێنانیشیان هەبێت بە مەرجێك باوکەکە پێی لەسەر بێکاری دانەگرتبیٚ)).

**بە پێی حوکمەکانی یاسای باری کەسیی عێراقی گرێبەستی هاوسەرگیری بە دوو ڕێگا کۆتایی پێ دێت، ئەویشیان تەلاَقدان و لێکجیابوونەوەو مخالەعەیە.**

وە لەبەرئەوەی عیددەش پەیوەندیدارە بەو دوو مەسەلەیە، بۆیە لە چوار خاڵدا باسی هەریەکێك لە تەلاَق و لێکجیابوونەوەو مخالەعەو عیددە دەکەین:

## یەکەم: تەلاَق (جیابوونەوە)

بەپێی یاسای باری کەسیی عێراقیو شەریعەتی ئیسلام تەلاَق مانای هەلگرتنی کۆتی ژن و مێردایەتییە، دەموودەست یان دوای تێپەڕبوونی ماوەی عیددە[1]، بە لەفزێکی تایبەتی یان هەر شتێك جێگای ئەو لەفزە بگرێتەوە[2].

لەبنەڕەتدا، پیاو مافی تەلاَقدانی بەدەستەوەیە هەرکاتێك لێهاتوویی یاساییو شەرعی تەواو کردبێتو ئاقڵ بێت. چونکە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەر هەروەها یاسا وەك بنەمایەك ئەم مافەیان داوە بەپیاو، هەروەها وەکو ڕیزپەڕیش ئافرەت ئەم مافەی دەبێت ئەگەرهاتوو بەمەرجی ئەوە هاوسەرگیری بەستبێ کە تەلاَق بەدەستی ئەو بێت.

خوای گەورە لە سورەتی تەلاَق لە ئایەتی/١ دەفەرموێ: ((يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ)) واتە: ((ئەی پێغەمبەر هەرکاتێ ویستتان ژنان تەلاَق بدەن لەکاتی عیددە تەلاَقیان بدەن ئەو کاتەی لە حەیز پاك بوونەتەوەو لەگەڵ مێردەکانیان جووت نەبوونە)).هەروەها لە سورەتی (بەقەرە) ئایەتی/ ٢٣٦ دەفەرموێ: ((ولاجناح عليكم ان طلقتم النساء مالم تمسوهن أو تفرضوا لهن

---

[1] -عیددە(عدة) بەو ماوەیە دەوترێ کە نابێت ژن تیایدا مێرد بکاتەوە تا بەسەر نەچێت. وە بەپێی بڕگەی دوو لە ماددە/٤٧ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا عیددەی تەلاَق تێپەڕبوونی سێ بێنوێژییە بەسەر ژندا.

[2] -محمد مصطفى شلبي: احكام الاسرة في الاسلام، ط/١، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٩٧ ل٤٧١.

فریضـة)) واتـە: ((ئەگـەر ژنـەکانتان تـەلأق بـدەن تاوانێکتـان لەسـەر نیـە، مـادام نێزیکیتان لەگـەڵ نـەکردبن یـا مارەییێکتـان بـۆ دیـاری نـەکردبێتن)). هـەروەها لـە سورەتی (الاحزاب) ئایەتی/ ٤٩ دەفەرمویٚ: ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذْا نَكَحْتُمُ المُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ)) واتە: ((ئەی ئـەو کەسانەی کـە بڕواتـان هێنـاوە، کـاتیٚ کـە ژنـانی بڕوادارتان لەخۆتان مارەکردو لەپاشـان تـەلأقتان دان)) وە لـە سـورەتی (النسـاء) ئایـــەتی/٢٠ دەفـــەرمویٚ: ((وَإِنْ أَرَدتُّـمُ اسْـتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَـانَ زَوْجٍ وآتَيْـتُمْ إِحْـدَاهُنَّ قِنْطَارًا)) واتە: ((ئەگەر ویستتان لەجیاتی ژنێك کە ئێستا هەتانە ژنێکی تر بهێـنن، وە بە یەکیٚ لەو ژنانەماڵێکی زۆرتان بە ناوی مـارەیی داوە، هـیچ شـتێك لـەوماڵو دراوە لەو ژنە مەستێننەوە)). ئەمەو پێغەمبەریش (د.خ) دەفەرمویٚ : ((یا عبد الله بن عمر طلق زوجتك)) هەروەها لـە فەرموودەیـەکی تـردا هـاتووە: ((مابـال احـدکم یزوج عبده امته ثم یرید ان یفرق بینهما انما الطلاق لمن اخذ بالساق))[١].

بـەپێی ئـەم دەقانـە کـە زۆر بـە ڕاشـکاوەیی مـافی تەلأقـدان دراوە بـە پیـاو، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە مافی ژن خورابێت، بەڵکو بۆ پاراستنیو پیرۆزڕاگرتنـی پەیوەندیی هاوسەرگیرییەکە. ئەمەو لە هەمان کاتیشدا هیچ ڕێگرییێك نیە لەبەردەم ئافرەت بۆ ئەوەی لەکاتی بەستنی گرێبەستی هاوسەرگیری بەو مەرجە مێرد بکـات کە تەلأق بە دەستی خۆی بێت.

شـایەنی ئامـاژە بۆکردنـە، هەربۆیـەش مـافی تەلأقـدان نـەدراوە بـە ژنو مێـرد بەیەکەوە، ئەگینا لەوانەیە زۆرجاران هەردووکیان ڕێك نەکەوتنایە لەسەر تەلأقدان، چـونکە یـەکێکیان تـەلأقی دەویسـتو ئـەوەی تریـان نەیدەویسـتو بـەم شـێوەیە

[١] -بڕوانە محمد مصطفی شلبي: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٧٣.

ژیانیــان دەبــوو بــە دۆزەخ‌و نەیانــدەتوانی کۆتــایی بــە پەیوەنــدیی هاوســەرگیری نێوانیان بهێنن.

یاسای باری کەسیی عێراقی لە بڕگە/١ی مـاددە/٣٤ دا مـافی تەلاقـدانی داوە بە پیاو وەبەژنیش ئەگەر بریکاربێ یا ڕێگاپێدراو بێ هەروەها دادوەر، کە ئەمـەش دەقەکەیەتی: ((تەلاق لابردنی کۆتی هاوسەرگیرییە بە خستنی لەلایەن مێردەوە یا لەلایەن ژنەوە ئەگەر بریکاربێ یا ڕێگاپێدراو بێ یان بەهۆی دادوەرەوە......)).

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکـەوێ کـە یاسـادانەر بـە مەبەسـتی ڕاگرتنـی هاوسـەنگی لەنێوان پیاوو ژن مافی تەلاق خستنی داوە بە دادوەر، بۆئەوەی لەو حاڵەتانەی کە ژن تیایـدا بریکـار نـەبێ یـان ڕێگاپێـدراو نـەبی بەخسـتنی تەلاقەکـەی لـە مێردەکەی،لـەڕێگای دادگـاوە خـراپ بەکارنـەهێنانی تەلاقەکـەی لەلایـەن مێردەکەیەوە بۆی زامن کراوە.

جا بەپێی قورئـانی پـیرۆز، پیـاو تـەنها سێ تـەلاقی بـۆ لابردنـی پەیوەنـدی هاوسـەرگیری بەدەسـتەوەیە، هـەروەکو لـە سـورەتی (البقـرة) ئایـەتی/ ٢٢٩ دەفـەرموێ ((الطَّـلاقُ مَرَّتَـانِ فَإِمْسَـاكٌ بِمَعْـرُوفٍ أَوْ تَسْـرِيحٌ بِإِحْسَـانٍ.....)) واتـە: ((تەلاقدانی ژن دوو جارە، جا دوایـی دەبـێ بەچـاکی مامەڵـە لەگـەڵ ژن بکـرێ یـا بەچاکی لێکجیاببنەوە)). هەروەها لە سورەتی (بەقەرە) ئایـەتی/٢٣٠ دەفـەرموێ: (( فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)) واتـە: ((جـا ئەگـەر دوای دوو تەلاقەکەو گەڕانەوەی بۆ جاری سێیەم ژنەکەی تەلاقـدا، لـەوە بـە دواوە دوای تەلاقی سێیەم ئەوژنەی بۆ حەلاڵ نیە، مەگەر مێردێکی تر بکاتەوە)).

بەهەمان شێوە، یاسادانەری عێراقـی لـە مـاددە/٣٨ی یاسـای بـاری کەسـیدا هەمان حوکمی داوە، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((تەلاقدان دوو بەشـە: ١- تـەلاقی

گەڕاوە(الطلاق الرجعي): لەم جۆرە تەڵاقەدا مێردەکە بۆی هەیە، لەماوەی عیددەدا بەبێ گرێبەست ژنەکەی بگەڕێنێتەوە، پێویستە گەڕاندنەوەکە بسەلمێندرێت وەکو سەلماندنی تەڵاق)).

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ تەڵاق دوو جۆری هەیە، تەڵاقی بەرگەڕانەوەو تەڵاقی جوداکەر(الطلاق البائن)، لە خوارەوە لە دوو خاڵدا بە درێژی باسیان دەکەین:

## ١- تەڵاقی بەرگەڕانەوە (الطلاق الرجعي)

لەم جۆرە تەڵاقەدا، مێرد بۆی هەیە لەماوەی عیددەدا بەبێ گرێبەستی نوی ژنەکەی بۆلای خۆی بگەڕێنێتەوە. واتە پێویست بە گرێبەستی نوێو مارەیی نوێ ناکات مادام ژنەکەی ماوەی عیددەی بەسەرنەچووە.

لە دەقی بڕگە/١ لە مادده/٣٨ی یاسای باری کەسیی عێراقیدا هاتووە: ((١- تەڵاقی بەرگەڕانەوە: لەم جۆرە تەڵاقەدا مێردەکەی بۆی هەیە، لە ماوەی عیددەدا بەبێ گرێبەست ژنەکەی بگەڕێنێتەوەن پێویستە گەڕاندنەوەکە بسەلمێندرێت وەکو سەلماندنی تەڵاق)).

لەم دەقەدا بۆمان دەردەکەوێ، بەمجۆرە تەڵاقە دەوترێ، تەڵاقی بەرگەڕاوە، کە پیاو لە ژنەکەی دەیخات کە بەهەقیقەت لەگەڵی جووت بووە، خستنێك کە بەبی بەرامبەری دارایی بێت، هەروەها پێشتر هیچ تەڵاقی تری نەدابێت یان پێشتر تەنها یەك تەڵاقی دابێت.

بۆچی جووتبوون مەرجە بۆ تەڵاقی بەرگەڕاوە؟ چونکە لە تەڵاقی بەرگەڕاوەدا پیاو بۆی هەیە لەماوەی عیددەدا ژنەکەی بۆخۆی بگەڕێنێتەوە. وە لەبەرئەوەی

تەڵاقدانی ژن بەر لە جووتبوون عیددەی لەگەڵ نیە، کەواتە پیاوەکە بۆی نیە بیگەڕێنێتەوە. هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی ((الاحزاب)) ئایەتی/٤٩ دەفەرموێ: (( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا)) واتە: ((ئەی ئەوکەسانەی کە بڕواتان هێناوە، کاتێك کە ژنانی بڕوادارتان لەخۆتان مارەکردو لەپاشان بەرلەوەی دەستیان لەگەڵ تێکەڵاو بکەن تەڵاقتان دان، جا عیددەیان بۆ ئێوە لەسەر نیە کە بیژمێرن، جا بە دیاری دڵخۆشیان بکەنو بە جوانیو پیاوانە دەستیان لێ بەربدەن)) . جا کەواتە ئەگەر پیاوێك ژنی هێنابێت بەڵام بەرلەوەی بیگوازێتەوەو لەگەڵی جووتبێت، تەڵاقی بدات، لەم حاڵەتەدا ژنەکە عیددەی لەسەر نیە، بۆیە تەڵاقەکە جوداکەرەوە (بینونة) دەبێو پیاوەکە بۆی نیە ژنەکەی بۆلای خۆی بیگەڕێنێتەوە تا مێردێکی تر نەکاتو لەگەڵیشیدا جووت نەبێ بەپێی فەرمودەی خوای گەورە لە سورەتی (بەقەرە) ئایەتی (٢٣٠): ((فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)).هەروەکو دواتر لە باسکردنی تەڵاقی جوداکەرەوەدا بە درێژی باسی لێوە دەکەین[١].

وە تەڵاقدانیش بەرامبەر وەرگرتنی بڕێك پارە بریتیە لە ڕێکەوتنی پیاوو ژن لەسەر کۆتایی هێنان بە گرێبەستی هاوسەرگیری بەرامبەر بڕێك پارە، ژنەکە دەیداتە مێردەکەی، پێی دەوترێ تەڵاقی بەرامبەر پارە[٢].

---

[١] -فريد فتيان: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل١٢٠-١٢١.

[٢] - د.مصطفى السباعي: شرح قانون الاحوال الشخصية، ج/١، الزواج وانحلاله، دار الوراق للنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠٠١ ل٢٢٥.

ئەم جۆرە تەلاقـە جوداکەرەوەیـە چـونکە تـەلاقێکی ئـارەزوو مەندانەیـەو بـۆ ئـازادکردنی ژن لـە مێردەکـەی بەرامبـەر بەخشـینی بڕێـك پـارە ئـەنجام دەدرێ، جیاوازە لە تەلاقی بەرگەڕانەوە کە مافی پیاو بەسـەر ژنەکـەی لـەماوەی عیـددەدا هەر دەمێنێ‌و دەتوانێ بیگەڕێنێتەوە[1].

شـایەنی ئاماژەبۆکردنـە، بـەپێی مـاددە/ ١٠٠ی یاسـای بـاری کەسـیی سـووری ئەگەر کۆتایی هێنانی هاوسەرگیری بـەبێ بەرامبـەربێت، ئـەوا لـە حـوکمی تـەلاقی بەرگەڕانەوە دەبێ نەك جوداکەرەوە، ئەمەش لـە حاڵەتێکـدا دەبـێ، ئەگـەرهاتوو، هەردوو هاوسەر بەرامبەرەکەیان ڕەتکردەوە[2].

کەواتـە، لـە تـەلاقی بەرگەڕانـەوەدا، پەیوەنـدی هاوسـەرگیری هـەردەمێنێ تـا ماوەی عیددەی ژن بمێنێ. وە ئەگەر لەو ماوەیەدا، یەکێك لە هاوسەرەکان گیـانی لەدەسـت دا ئـەوەی تـر میراتـی لێ دەگرێـت، چـونکە هاوسـەرگیرییەکە هێشـتان کۆتـایی پـێ نـەهاتووە، بـەلام بـە تـەواوبوونی عیـددە، پیـاو مـافی گەڕانـەوەی هاوسەرەکەی‌و جوتبوونی لەگەڵیدا نامێنـێ‌و دەبـێ مارەییەکـەی بـداتێ‌و هۆکـاری میرات لێکگرتنیشیان نامێنـێ، بـەلام پیـاو بـۆی هەیـە دوای بەسەرچـوونی مـاوەی عیـددەش هـەرکاتێك بیـەوێ تەلاقدراوەکـەی بـە گرێبەسـتێکی هاوسـەرگیری نـوێ بگەڕێنێتەوە بۆ خۆی بەمەرجێك مێردی نەکردبێتەوە[3].

خـوای گـەورە مـافی گەڕانـەوەی تـەنها بـە پیـاو داوە لـەماوەی عیـددەدا، جـا گرینگ نیە ژن ڕازی بێت یان نـا بـەپێی ئـەم فەرموودەیـە لـە سـورەتی (بەقـەرە)

[1] - فريد فتيان: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل١٢١.

[2] -بڕوانە د.مصطفى السباعي: شرح قانون الاحوال الشخصية، سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٦.

[3] -محمد مصطفى شلبي: احكام الاسرة في الاسلام، ط/٢، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧٧ ل٥٠٣.

ئایــەتی (٢٢٨): ((وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاحًا)) واتــە: ((مێردەکانیان لە پیاوانی تر لەپێشترن کە لە ماوەی عیددەدا بیانگێڕنـەوە ئەگـەر مەبەستیان خۆچاککردنەوە بێت)).

گەڕانەوەی ژن بە دوو ڕێگا ئەنجام دەدرێ، بەقسەو بـە هـەموو ئـەو شـتانەی جێگەی دەگرنەوە لە نوسینو ئاماژەبۆکردنو بە کردەوە.

گەڕاندنەوەی بەقسە، دەبێ بە ووتەی ڕاشکاو بێت کـە لـە مانـای گەڕاندنـەوە بـەولاوە هـیچ مانایـەکی تـر نەگەیـەنێت. بۆنموونـە پیاوەکـە بڵـێ ژنەکـەی خـۆم گەڕاندەوە یان ڕووی تێ بکاتو پێی بڵێ تۆم گەڕاندەوە یان تۆم گرتەوە......هتد. وە ئەم ووتانە پێویستی بە نیـازی ڕاشـکاو نیـەو گەڕانـەوەی پـێ ئـەنجام ئـەدرێ. هەروەها نووسین و ئاماژەبۆکردن جێگای ووتن دەگرێتەوە بۆ گەڕاندنەوە.

ئەمـەو گەڕانـەوە بـە کـردەوە دەبێـت ئەگـەرهاتوو لەگـەڵی جـووت بێـت یـان بـە زەوقەوە لە ئامێزی بگرێتو ماچی بکات.

جا دوای ئەمە، پیاو تەنها دوو تەلاقی لەدەست دەمێنێ لە کۆی سێ تەلاق کـە پێشتر هـەیبوو، هـەروەها مـاوەی هاوسـەرگیرییەکەش سـنووردار دەبـێ بـەماوەی عیددە پاش ئەوەی پێشتر ماوەکەی سنووردار نەبوو، وە بە کۆتایی هاتنی عیددە بەتەواوەتی کۆتایی دێت بە ماوەی هاوسەرگیرییەکەو پیاوەکە هـیچ مـافی بەسـەر ژنەکەیەوە نامێنێ.

## ٢-تەلاقی جوداکەر (الطلاق البائن)

تـەلاقی جوداکـەر، بـەوجۆرە تەلاقـە دەوتـرێ کـە پەیوەنـدی هاوسـەرگیری دەمودەسـت نـاهێڵێو ژیـانی هاوسـەرگیریش دوای ئـەوە درێـژەی نابێـت بـەبێ

ڕێکەوتنێکی نوێ‌و مارەییەکی نوێ. واتە مێردەکە بۆی نیە ژنەکەی بۆلای خۆی بگەڕێنێتەوە چ لە ماوەی عیددەدا یان لە دوای عیددەدا تا جارێکی تر لەگەڵی ڕێك نەکەوێتەوەو گرێبەستێکی هاوسەرگیری سەر لە نوێ بە مارەییێکی نوێ لەگەڵ نەبەستێت.

**تەلاقی جوداکەریش بەپێی ژمارەی تەلاقەکان دەبێتە دوو جۆر:**

**أ- جوداکەرەوەی بچووك (بينونة صغرى)**

ئەوجۆرە تەلاقەیە کە تیایدا ڕێگا بە مێرد دراوە کە بە ڕێکەوتنێکی نوێ‌و مارەییێکی نوێ وە ژنەکەی بۆ لای خۆی بگەڕێنێتەوە. واتە مێردەکە بۆی نیە لە ماوەی عیددەدا بیگەڕێنێتەوە لای خۆی یان لەگەڵی جووت بێت تا سەرلەنوێ گرێبەستێکی هاوسەرگیری لەگەڵ نەبەستێت کە دەبێ گشت مەرجەکانی دروستی‌و سەپاوی‌و جێبەجێکردنیشی تیابێت، ئەمەش بە پێچەوانەی تەلاقی بەرگەڕاوەیە کە مێرد بۆی هەیە لەو ماوەیەدا ژنەکەی بۆ لای خۆی بگەڕێنێتەوە بە بێ گرێبەستی هاوسەرگیری نوێ‌و مارەیی نوێ[1].

**تەلاقی جوداکەری بچووك ئەم حاڵەتانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە:**

**١- تەلاقی پێش جووتبوونی ڕاستەقینە هەرچەندە ژنەکە گواسترابێتەوە:**

لەم ڕووەوە خوای گەورە لە سورەتی الاحزاب ئایەتی (٤٩) دەفەرموی: ((يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا)).

[1] - (د.محمد كمال الدين أمام: احكام الاسره، منشورات دار الجامعه الجديده، القاهره، ٢٠٠٧،ص٦٠

کەواتـە ئـەوپیاوەی ژنەکـەی خـۆی بـەر لـە جووتبـوون تـەلاَق دەدات هەرچـەندە گواستبێتیەوەش، ئـەوە دەگەیـەنیٚ کـە زۆر بـە پـەرۆش نـەبووە بـۆ ڕێزگـرتن لـەو پەیوەندییـە هاوسـەرگیرییە، جـا لەبەرئـەوەی هـیچ وەچـەیەكو نهێنیـەکیش لـە نێوانیانـدا نیـە، بۆیـە هـیچ هۆکارێـك نیـە بـۆ ئـەوەی بـەبیٚ ڕەزامەنـدی خـۆی بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی.

وە هەروەها لەبەرئەوەی هـیچ عیددەی لەسـەر نیـە بۆیـە ڕاسـتەوخۆ لـەکاتی فرێـدانی تەلاَقەکـە لەلایـەن مێـردەوە دەکـەویٚ. بـەلاَم واچـاکە بـەر لـە دووبـارە مێردکردنەوە ژنەکە چاوەڕێی بەسەرچوونی مـاوەی عیـددە بکـات ئەمـەش مانـای ئەوە ناگەیەنیٚ کـە پیاوەکـەی مـافی بردنـەوەی هـەبێت لـەو ماوەیـەدا، بـەڵکو بـۆ نەهێشتنی گومانە چونکە گواستراوەتەوە.

## ٢–تەلاَقدان لەسەر بڕێك پارە

ئەگـەرهاتوو ژنەکـە بڕێـك پـارەی دایـە مێردەکـەی بۆئـەوەی تـەلاَقی بـداتو کۆتایی بەو پەیوەندییە هاوسەرگیرییە بێنێت کە ئـارەزووی لەسـەر نیـە بـەردەوام بێت. لەو حاڵەتەشدا تەلاَقەکە دەکەوێتو جۆرەکەشی جوداکەری بچـووك دەبێـت، واتە مێردەکەی بۆی نیە بەبیٚ ڕەزامەندی خۆی بیباتەوە لای خـۆی. لەمبارەیـەوە خوای گەورە لە سورەتی البقرة ئایەتی(٢٢٩) دەفـەرمویٚ: ((.... فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ......)) واتە ((جا ئەگەر ترسان کە سنووری خوایان بۆ ڕانـاگیریٚ، گوناحیـان لەسـەر نیـە کـە ژنەکـە فیدیـە بـداتو دەسـت لـە مارەییەکەی هەڵبگریٚو خۆی ڕزگار بکات)).

**٣-تـەلاقی بەرگەڕانـەوە دوای تێپـەڕبوونی مـاوەی عیـددەو بـەبێ گەڕاندنـەوەی لەوماوەیەدا:**

ئەگەرهاتوو مێرد ژنەکەی بۆ جاری یەکەم تەلاق بـداتو لـە مـاوەی عیـددەش نەیباتەوە لای خۆی لەم حاڵەتەدا بە تێپەڕبوونی ماوەی عیددە جۆری تەلاقەکە لە تـەلاقی بەرگەڕانـەوە (رجعـي) دەگـۆڕێ بـۆ تـەلاقی جوداکـەری بچـووك (بينونـة صغرى).

**٤-هەر تەلاقێك بە حوکمی دادگا کەوتبێت:**

بەم شێوەیە بەپێی بڕگەی دوو لە ماددەی ٣٨ ی یاسای باری کەسـی عێراقـی هەموارکراو ئەگەرهاتوو تەلاقەکە کەوتو لە جۆری تەلاقی جوداکـەری بچـووك بـوو وەکو ئەم حاڵەتانەی کە لە سـەرەوە ئاماژەمـان پێـی دا ئـەوا حوکمەکـەی بریتـی دەبێ لە کۆتایی هێنانی پەیوەندی هاوسەرگیری دەمودەسـت. دەشـکرێ جـارێکی تر ئەم پەیوەندیە دروست بکرێتەوە بە گرێبەستێکی نوێو مارەیێکی نـوێ وە کـە ئەمـەش دەقەکەیـەتی: ((...تـەلاقی جوداکـەرەوەی بچـووك: لـەم جـۆرە تەلاقـەدا مێردەکە بۆی هەیە، ژنە تەلاقدراوەکەی خۆی بە گرێبەستێکی نوێ بهێنێتەوە)).

**ب-جوداکەرەوەی گەوری (بينونة كبرى):**

بەپێی بڕگەی دوو لە ماددەی ٣٨ ی یاسای باری کەسی عێراقی هـەموارکراو بـەو جۆرە تەلاقە دەووترێ جوداکـەری گـەورە کەتیایـدا نـەهی لـەوە کـراوە کـە مێـرد ژنـە تەلاقدراوەکەی کە سێ بە سێ لە سێ کـاتو شـوێنی جیاجیـادا تـەلاقی داوەو مـاوەی عیددەشی لە هەرهەموویان بەسەرچووە دووبـارە بیهێنێتـەوە. ئەمـەش دەقەکەیـەتی: ((..ب- تەلاقی جوداکەرەوەی گەورە: لـەم جـۆرە تەلاقـەدا مێردەکـە بـەهیچ جۆرێك

بۆی نیە، ژنە تەلاَقدراوەکەی خۆی کە سێ جاری جیا جیا تەلاَقی داوەو ماوەی عیددەکەشی بەسەرچووە بیهێنێتەوە)).

واتە ئەم جۆرە تەلاَقەیە، کە سێ بەسێ لەسێ کاتو شوێنی جیادا کەوتووە، یان تەواوکەری دوو تەلاَقی بەرگەڕاوەی پێشترە، بۆیە مێردەکە بۆی نیە ژنەکەی بۆ لای خۆی بگەڕێنێتەوە بە هەندێك مەرج نەبێت کە ئەمانەن:

١-پێویستە ژنە تەلاَقدراوەکەی مێردێکی تر بکاتەوەو بشگوێزرێتەوە. واتە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێکی تردا بکاتو لەگەلیشی جووت بێتو بەردەوام بێت لە ژیانی هاوسەرگیری، نەك وەك فێڵێکی شەرعیو یاسایی بۆ ماوەیەکی کاتی بێت.

٢-کۆتایی بەو پەیوەندییە هاوسەرگیرییە نوێیەی هاتبێت، بە مردنی مێردی دووەمی یان لەبەر هەر هۆیەك لە هۆیەکانی دەستلێکبەردان لەلایەن مێردی دووەمیەوە دەستی لێ هەلگیرابێت.

٣-ماوەی عیددەی بەسەرچووبێت

جا ئەگەر ئەو مەرجانەی سەرەوە هاتنەدی، هەروەها ماوەی عیددەی بەسەرچوو کە بریتییە لە سێ مانگ واتە سێ جاران لە بێنوێژییەکەی خۆی خاوێن بکاتەوە، ئەوکاتە مێردە کۆنەکە بۆی هەیە جارێکی تر بە ڕێکەوتنێکی نوێو مارەیێکی نوێ دووبارە ژنە کۆنەکەی بێنێتەوە.

**یاسادانەری عێراقی لە ماددەی ٣٥ دا ئاماژەی بە هەندێ كەس كردووە كە تەلاقیان لێ ناكەوێ كە ئەمانەی خوارەوەن:**

١-سەرخۆش‌و شێت‌و گێل‌و زۆرلێكراوو بێهۆش (فاقد التمیین) كە بەهۆی تورەی یان كارەساتێكی كت‌و پڕ یان گەورەیی تەمەنی یان لەبەر نەخۆشی ئەقڵ‌و هۆشی لە دەست دابێت.

٢-نەخۆشێك كە نەخۆشییەكەی هی مردن بێت، یان لە حاڵەتێكدا بێت كە لەو چەشنە حاڵەتانەدا بەردەوام بوونی ژیانی مەحاڵ بێت‌و ئەو نەخۆشە لە ئاكامی ئەو نەخۆشییە یان ئەو حاڵەتەدا گیانی لەدەست دابێت. ئەوكاتە ژنەكەی وێڕای ئەوەی تەلاقدراوە، میراتی لێ دەگرێت.

٣-ئەو تەلاقە ناكەوێت كە بە سوێندخواردن یان بە هەندێك مەرجەوە بەسترابێتەوە، لە ماددە ٣٦ ی یاسای باری كەسی عێراقیدا هاتووە: ((ئەو تەلاقە ناكەوێ كە پابەندی هەندێك مەرج بێت یان بەشێوەی سوێند بەكارهاتبێت)).

٤- تەلاقی تەواوكەری سێیەم‌و تەلاقی سێ بەسێ‌و مارەبەجاش

یاسای باری كەسی عێراقی ژمارە (١٨٨) ی ساڵی ١٩٥٩ی هەمواركراو لە ماددە/٣٧ دا مافی پیاوی لە خستنی تەلاق دا دیاری كردووەو دەڵێ: ((١- مێرد سێ تەلاقی دەرهەق بە ژنەكەی بە دەستەوەیە.

٢- تەلاقدانی گوتراو بە ژمارە چ بە قسە یان بە ئاماژەبۆكردن تەنیا یەك تەلاق دەخات.

٣- ئـەو ژنـەی سـێ جـاری جیاجیـا تـەڵاق بـدرێت، دەبێتـە تـەڵاقی جوداکـەری گەورە)).

بەم پێیە، ئەگەرهاتوو پیاوێـك ژنەکـەی خـۆی بـۆ سـێیەم جـار تـەڵاق دا، نـاتوانێ بیگەڕێنێتـەوە لای خـۆی مەگـەر مێردێکـی تـر بکاتـەوەو دواتـر دوای مردنـی ئـەو مێردەی یان دەستلێکبەردانیان ئەوجا بـۆی هەیـە بـە گرێبەسـتێکی هاوسـەرگیری نوێ‌و مارەییەکی نوێوە بگەڕێتەوە لای مێردی یەکەمین جاری، مەبەستیشـمان لـە تەڵاقی سێیەم ئەو تەڵاقەیە کە دوای دوو تەڵاق‌و دووجار گەڕانەوە دێت، هـەروەکو خودای گەورە لـە سـورەتی بەقـەرە ئایـەتی(٢٢٩) دەفـەرموێ: (( الطَّـلاقُ مَرَّتَـانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)). واتە: تەڵاق دانی ژن (تـەڵاقی ڕەجعـی) دوو جـارە، جـا دوایـی ئـەبێ بـە چـاکی ژن ڕابگـیرێ یـا بـە چـاکی لێـك جیـا ببنـەوە. سـەبارەت بـە تـەق دان بـۆ جـاری سـێیەم لـە سـورەتی بەقـەرە ئایـەتی(٢٣٠) دەفەرموێ: ((فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَـنْكِحَ زَوْجًـا غَيْـرَهُ)). واتـە: جـا ئەگەر (دوای دوو تەڵاقەکەو گەڕانەوەی بۆ جاری سێهەم) ژنەکەی تـەڵاق دا، ئـەوە دوای تەڵاقی سێیەم ئەوژنەی بۆ جەڵاڵ نیە، مەگەر مێردێکـی تـر بکاتەوە.ئەمـەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێ ئەو ژنە ماوەیەك لەگـەڵ مێـردە تازەکـەی بـژی، ئینجـا ئەگەر ئەو مێردە نوێیەی مرد یان لێك جیا بوونەوە، ئەوسا دەتوانێ مێرد بکاتەوە بە هاوسەرە کۆنەکەی.

جا بەم شێوەیە، ئەگەر پیاوێك ژنەکەی خۆی بۆ جاری سـێیەم تـەڵاق بـدات، واتـە دوای ئەوەی پێشتر دووجاران تەڵاقی دابێت‌و گەڕاندبێتیەوە لای خـۆی، ئـەوا هـیچ گومانمان نیە لەوەی کە تەڵاقەکە سێ بە سێ یەو ناتوانێ بیگەڕێنێتەوە لای خۆی

مەگەر هاوسەرەکەی مێردێکی تر بکاتەوەو کۆتایی بەو هاوسەرگیرییەی بێت جا چ بە مردنی مێردەکەی یان دەستلێکبەردانیان.

بەڵام ئەگەرهاتوو پیاوێك ژنەکەی خۆی لە یەك کاتداو لە یەك دانیشتندا بە کۆ سێ بە سێ تەڵاق بدات، بۆ نموونە بڵێ تۆ تەڵاق دراوی، تەڵاق دراوی، تەڵاق دراوی، یان بڵێ من تۆم سێ بە سێ تەڵاق داوە. لێرەدا چەند لێکدانەوەیەکی جیاواز بۆ جۆری کەوتنی تەڵاقەکە لێك دراوەتەوەو چەند ئاکامێکی جیاوازی لێ کەوتۆتەوە.

لەم بارەیەوە، یاسازانان بوونەتە دوو بەش، بەشێکیان پێیان وایە هەموو تەڵاقێکی سێ بە سێ جا چ بە قسە بێت یان بە ئاماژەبۆکردن، لە یەك دانیشتندا بێت یان زیاتر لە کاتێکی دیاریکراو دا بێت یان چەند کاتێکی جیا جیا، سێ بە سێ دەکەوێتو جۆرەکەی تەڵاقی جیاکەرەوەی گەورە یە (بینونە کبری)، لەوانە شافعیو حەنەفیو مالکیو کەسانی تر.

هەروەها هەندێکی تر پێیان وایە تەڵاقی سێ بە سێ بە کۆ پێچەوانەی فەرمانی قورئانی پیرۆزو ڕەفتارەکانی پێغەمبەر (السنة النبوية) بۆیە ناکەوێت، لەوانە الروضة البهية وابن التميمة وابن القيم والشيخ على الخفيف[1].

ئەو یاسازانانە بەڵگەیان بۆ نەکەوتنی تەڵاقی سێ بە سێ بە جارێك قورئانی پیرۆزە کە دەڵێ: ((الطَّلاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ)) جا پێیان وایە لەبەر ئەوەی تەڵاقی سێ بە سێ بە جارێك پێچەوانەی ئەم دەقەیە بۆیە

---

[1] - لە د. مستەفا زەڵمی وەرگیراوە بڕوانە الدكتور مصطفى الزلمي: الطلاق المقترن بالعدد لايقع به الا طلقة واحدة، بلا جهة النشر وسنة النشر، ص٨ ومابعدها

بدعەیە، بدعەش ڕەتکراوەتەوە بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) کە دەفـەرموێ ((من عمل عملا ليس عليه امرنا فهو رد)) صحيح مسلم ٣٢٤٣[1].

هەروەکو لە صحيح مسلم لەسـەر زاری ابـن عبـاس دا هـاتووە کـە دەڵـێ: ((تـەڵاق لـە سـەردەمی پێغەمبـەری خـوا (د.خ)و خەلیفـە ئـەبوو بـەکرو تـا دوای دوو سـاڵیش لـە خەلافەتی عومەری کوڕی خەتاب تەڵاقی سێ بە سێ بە یەك تەڵاق هەژمار کراوە.

کەواتە، سەرچاوەی ڕای ئەو دوو یاسازانانەی کە تەڵاقی سێ بە سێ بە ژمارە بـە سـێ تـەڵاق دادەنـێن دەگەڕێتـەوە بـۆ لێکدانـەوەی خەلیفـە عومـەری کـوڕی خـەتاب لـەم بارەیەوە کە پشتی بە سیاسـەتی شـەرعی بەسـتووە کـە خـۆی لـە سـنووردار کردنـی ڕێگەپێدراو یان گۆڕینی حوکم دێت بەپێی پێویست لەسەر بنـەمای ئامـانجی شـەرعیو بەرژەوەندی گشتی. بـەم پێیـە کـار بـەم سیاسـەتە شـەرعییە دەکرێت ئەگـەر هـاتوو ئامـانجو مەبەسـتی خـۆی پێکـا، بـەڵام لەسـەر موسـڵمانان پێویسـتە بگەڕێنـەوە بـۆ سەرچاوەی سەرەکی لە قورئانی پیرۆزو سوننەی نەبەوی لەسەر ئـەم بنـەما شـەرعییە کە دەڵێ: ((ان الجكم يدور مع علته وجودا وعدما)) واتە حوکم بـە دەوری هۆکارەکـەی دەخولێتـەوە بـە بـوونو بـە نـەبوون، جـا ئەگـەرهاتوو ئەوئامانجـەی حوکمەکـەی بـۆ دەرچووە هاتەدی ئەوا حوکمەکە جێ بەجێ دەکرێت، بەڵام ئەگـەرهاتوو ئـەو ئامانجـە نەهاتە دی ئەوا کار بەو حوکمە لێکدانەوییە نائاسابیە ناکرێت[2].

مامۆستا مسـتەفا زەڵمـی لـەبارەی مەبەسـتی خەلیفـە عومـەری کـوڕی خـەتاب (ڕ.خ) دەڵـێ: ((مەبەسـتی پابەنـدکردنی خـەڵك بـووە بـە ووتـەکانیانو ئەوپابەندیانـەی کـە

---

[1] - لە د. مستەفا زەڵمی وەرگیراوە بڕوانە الدكتور مصطفى الزلمي: الطلاق المقترن بالعدد لايقع به الا طلقة واحدة، سەرچاوەی پێشوو، ل٨-٩

[2] - البروفيسور الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي: الطلاق مرتان في تفاسير القرآن، ط/٣، ٢٠١١،ص٢٤.

خۆیانیان پێوە بەستۆتەوە، وەك سزایەكی تەعزیری، بۆیە خەڵكی پابەند كردووە بە تەلاقی سێ بە سێ بە جارێك وەك سزایەكی تەعزیری، بۆئەوەی خۆیان بە دوور بگرن لە تەلاقدانی سێ بە سێ بە جارێك و بگەڕێنەوە بۆ یەك تەلاق[1].

جا بەم شێوەیە دوای ئەوەی عومەری كوڕی خەتاب تەلاقی سێ بە سێی بە سێ تەلاق هەژمار كرد، هەر لەو كاتەوە تاكو ئێستا زۆربەی زانایانی ئەهلی سوننە لەسەری ڕۆیشتوون.

بەهەرحاڵ، ئەگەرهاتوو تەلاقەكە تەواوكەری دووجار تەلاقدانی پێشوو بێت، ئەوا بە تەلاقی سێیەم جار هەژمار دەكرێت و دەبێتە تەلاقی جوداكەری گەورەو لەم حاڵەتەشدا پیاوەكە بۆی نیە ژنە تەلاقدراوەكەی بگەڕێنێتەوە لای خۆی تا مێردێكی تر نەكاتەوەو كۆتایی بە هاوسەرگیرییەكەی نەیەت بە مردنی مێردی دووەمی یان لێك جیابوونەوەیان و بەسەرچوونی ماوەی عیددە.

بەڵام هەر لە كۆنەوەو تاكو ئێستاش هەندێك زانای ئایینی پەنا دەبەنە بەر فێڵێكی شەرعی بۆ گەڕاندنەوەی ئەو ژنەی بۆ جاری سێیەم تەلاق دراوە یان سێ بە سێ بەجارێك تەلاق دراوە بە زووترین كات و بێ گوێ دانە ئەو ڕێ و شوێنانەی كە قورئانی پیرۆزو سوننەی نەبەوی بۆ ئەم مەبەستە دایان ناون هەروەكو لەسەرەوە ئاماژەمان پێ كردن. فێڵەكەش ئەوەیە كە ژنە تەلاقدراوەكە بۆ جاری سێیەم یان سێ بە سێ هەركاتێك عیددەی تەواو بوو بە دزی لە پیاوێك مارەیان دەكرد بۆ ماوەیەكی كورت كە چەند كاتژمێرێكی تێپەڕنەدەكرد، ئینجا ئەو پیاوە دەچووە لای ژنەكە، لەپاش

---

[1] - البروفيسور الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي: الطلاق مرتان في تفاسير القرآن، سەرچاوەی پێشوو،ل٢٤

جووت بوون تەلاقی دەدایەوەو لەپاش تەواوبوونی عیددە مارەیان دەکردەوە لە مێردی پێشووی.

مامۆستا مستەفا زەڵمی لەم بارەیەوە لە میانی گێڕانەوەی یاداشتنامەی ژیانیدا بیرەوەرییێکی تاڵی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((لە ماوەی ژیانمدا هەڵەی زۆرم کردووە، هەندێکی لەبەر ئەوە بووە دوای یەکێکی تر کەوتووم وام زانیوە قەت هەڵەناکات، بەم جۆرە دوو جار مارە بە جاشم کردووە لەسەر مەزهەبی ئیمام شافعی خوا لێی ڕازی بێت، یەکەمیان ساڵی ١٩٤٦ لە دێی زەڵم، دووەمیان ١٩٤٧ لەسەر سیان. ئەوەی یەکەم جار لەدێی زەڵم، ژنی شوانی مەڕەکان بوو مارەم کرد لە فەقێیەکی خۆم، ئینجا کە خەڵکەکە زانیان بە فەقێکەیان دەووت (جاش) ئیتر ئەویش دێیەکەی بەجێهێشت، ڕۆژێکیان زۆر بێ تاقەت بووم، باوکم خوا لێی خۆشبێت، وتی: خەفەت دەخۆیت؟ بۆ مەمنوونی خودا نابیت، ئەگەر ژنەکە بیوتایە مامۆستا خۆی بووە بە جاشم چیت دەکرد؟))[1].

شایەنی ئامارەبۆکردنە، لە ئاکامی ئەم لێکدانەوەیە هەڵەیەدا، دەیان خێزان لێکترازاونو پەیوەندی هاوسەرگیری نێوان دەیان ژنو مێرد کۆتایی پێ هاتووە، چونکە هەموو پیاوێك ئەو ئامادەییەی تیا نەبووە کە مارەبەجاشی قبوڵ بکات، لە کاتێکدا ئەگەر تەلاقەکەی سێ بە سێ بە ژمارە بە جارێك بووبێت، یان لە ئاکامی فێڵێکی شەرعی بووبێت بە فڕەدانی تەلاق لە سێ دانیشتنی جیا جیا لە ماوەیەکی زۆر کورتداو بە دوای یەکەوە.

---

[1] - دکتۆر موستەفا ئیبراهیم زەڵمی: کاروانی ژیانم، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ٢٠١٤، ل١٤٧–١٤٨

ساڵی ١٩٨٧ کاتێك قوتابی قۆناغی سێیەمی کۆلێژی یاسای زانکۆی سەلاحەددین بووم لە شاری هەولێر، لە میانی سەردانێکی زانستیمان بۆ دادگای باری کەسی هەولێر بۆ بینینی دادگایی کردنەکانی ئەو دادگایە، یەکێك لەو کەیسانەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام‌و ئێستاش لە بیری ناکەم، تایبەت بوو بە پەسندکردنی تەلاقێکی سێ بەسێ.
دادوەری کەیسەکە دادوەر تحسین ئەرسەلان ڕووی کردە مێردی ژنە تەلاقدراوەکەو ووتی: (چۆن ئەو ژنەت تەلاق داوە؟ ووتی: گەورەم سێ بەسێ.ووتی: شایەتت هەیە؟ ووتی بەڵێ. ئەوەبوو شایەتەکە مەلایەك بوو، کە بانگیان کردە ژوورەوە بۆ شایەتی دان، لەبەردەم دادگا ووتی: سێ شوێنی جیا جیامان لە سێ کاتی جیا جیا بەو ژن‌و مێردە کردووەو لە هەر سێ جاریش مێردەکەی تەلاقی فڕێ داوە.
دادوەر بەم ووتەیە زۆر تووڕە بوو ووتی: مەلا خوا بتگرێ لە جیاتی ئەوەی ڕۆڵێکی باش ببینیت بۆ ئەم تەلاقەت سێ بە سێ خست کە بە کەس چاك نەبێتەوە!!
جا ئەوبوو بڕیاریدا مەلایەکە بۆ ماوەی یەك مانگ زیندانی بکرێت‌و ڕەوانەی بەندیخانەی محەتەی کرد.
ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت، ئەوەیە، ئەم تەلاقە وێڕای ئەوەی لە سێ دانیشتن‌و سێ کاتی جیاجیادا فڕێ دراوە، بەلاّم بە تەلاقی سێ بە سێ یان تەواوکەری تەلاقی سێ بەسێ هەژمار ناکرێت، چونکە تەواوکەری تەلاقی سێ بەسێ بەو حاڵەتە دەووترێ کە پیاو ژنەکەی جارێك تەلاق بدات‌و دواتر بە تێپەڕبوونی ماوەی عیددە بیگەڕێنێتەوە، دواتر جارێکی تر تەلاقی بداتەوەو دیسان بە تێپەڕبوونی ماوەی عیددە بیگەڕێنێتەوە، دواتر بۆ جاری سێیەم تەلاقی بدات.

کەواتە لە کاتی تەڵاق دانەکە، نابێت ژنەکە لەناو عیددەی تەڵاقی پێشوو دابێت یان لە ناو بێ‌ نوێژی دابێت یان پاك بووبێتەوە بەڵام مێردەکەی چووبێتە لای[1] ، لەوحاڵەتەشدا، تەڵاقەکەی جوداکەری گەورە دەبێت‌و ژنە تەڵاقدراوەکەی تا مێردێکی تر نەکاتەوەو کۆتایی بە هاوسەرگیرییەکەی نەیەت بە مردنی مێردی دووەمی یان جیابوونەوەیان‌و بەسەرچوونی ماوەی عیددە، بۆی نیە بچێتەوە لای مێردی یەکەمی هەروەکو خوا دەفەرموێ: ((فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ)).

## ٤-ژنی تەڵاق دراو مافی بژێوی‌و نیشتەنی هەیە ئەگەر زێدەڕۆیی کرا لە خستنی تەڵاقدا

هەر لە دێرزەمانەوە ئافرەت بە بوونەوەرێکی لاوازو ناسك لە قەڵەم دراوە بۆیە گشت یاسا کۆنەکان لە ڕێکخستنی حوکمەکانی باری کەسی‌و کۆمەڵایەتیدا ڕەچاوی ئەمەیان کردووەو هەوڵی پاراستن‌و پشتگیری کردنی ئافرەتیان داوە. یاسای حامورابی کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (١٦٩٤ پ.ز) دیارترین نموونەی ئەو یاسایانەیە.

شایەنی باسە، یاسادانەری زۆربەی وڵاتانی دونیا لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئەم تێڕوانینەی کۆنیان هەیە بەڵام لەگەڵ هەندێك جیاوازی کە ڕەنگ بێت لەگەڵ بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەڕەنسی‌و جاڕی گەردوون بۆ مافی مرۆڤ نەگونجێ، کە لە سەرووی هەموویانەوە مافی یەکسانی دێ.

بەهەرحاڵ، لەبەرئەوەی بەپێی شەریعەتی ئیسلام تەڵاق خستن لە دەستی پیاوە بۆیە یاسادانەری عیراقی بەمەبەستی پاراستن‌و پشتگیری کردنی ئافرەت لە

[1] - البروفيسور الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي: الطلاق مرتان في تفاسير القرآن، المصدر السابق، ص٢٨

زێدەڕۆیی پیاو لە خستنی تەڵاق بە ناهەق هەندێك حوکمی لە یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە (١٨٨) ی ساڵی ١٩٥٩ ڕێکخستووە.

لە ڕاستیدا ئەم حوکمانەی بۆ دابینکردنی بژێوو نیشتەنی بۆ ژنی تەڵاق دراو لە ئەنجامی تەڵاقدانێکی بە ناهەق تەرخان کردووە.

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەوا ڕێك دەکەوێ زۆربەی ژنە تەڵاقدراوەکان بەبێ بژێوو شوێنی حەوانەوە دەمێننەوە، بۆیە دادی کۆمەڵایەتی وا دەخوازێ کە ئەم چینە ئافرەتە لەم مافە بێ بەش نەکرێن ئەگەر تەڵاق دان یان دەست لێ بەردانەکە لە ئەنجامی زێدەڕۆیی مێردەکەوە دابێ.

بۆیە لەم حاڵەتەدا، ژنە تەڵاقدراوەکە بۆی هەیە داوای دابینکردنی بژێوی سێ ساڵ لە مێردە تەڵاقکەوتووەکەی بکات لەگەڵ بەردەوام بوونی لە نیشتەجێ بوونیدا لەناو خانووی ئەودا.

بۆ ئەم مەبەستە، ژنە تەڵاقدراوەکە دەتوانێ لە هەمان دانیشتنی دادگا بۆ سەیرکردنی کێشەی تەڵاق دانەکە داوای ئەم مافانە بکات، وەیان بە داوایەکی سەربەخۆ ئەمە داوا بکات. بەڵام پێش ئەوەی دادگا ئەم بڕیارە بدات پێویستە لەوە بکۆڵێتەوە ئایا کەمتەرخەمیەکە لە مێردەکەیە یان ژنەکە وەیان لە هەردووکیان.

ئەگەر کەمتەرخەمیەکە (تقصیر) لە مێردەکە بوو ئەوا ژنەکە ئەم مافەی دەکەوێ، بەڵام بەپێچەوانەوە لەو دوو حاڵەتەی دواییدا نایکەوێ. وە بۆ ئەم مەبەستەش دادگا پشت بە ڕاپۆرتی لێکۆڵەرەوەی کۆمەڵایەتی (باحثة اجتماعیة) دەبەستێ.

ئەمەی خوارەوە دەقی ماددەی (٣٩) بڕگەی سێیەمە لە یاسای ناوبراو: ((ئەگەر پیاو ژنی خۆی تەڵاق داو دادگا بۆی بەدەرکەوت کە پیاوەکە لە تەڵاق

خستنەکەیدا زێدەڕۆیی کردووەو ژنەکە لە ئەنجامی ئەمەدا زیانی پێ گەیشتووە، لەسەر داوای ژنەکە دادگا بڕیار دەدا کە پیاوە تەلاَق کەوتووەکەی قەرەبووی ئەو زیانانەی بۆ بکاتەوە بە شێوەیەك لەگەڵ باری دارایی‌و ڕادەی زێدەڕۆییەکەی بگونجێ. یەکەم جار ئەم قەرەبووە دەخەملێندرێ بە چەشنێ کە نابێ بڕێوەکەی لە ماوەی دوو ساڵ ڕەت بکات سەرەڕای مافە چەسپاوەکانی تری.

هەروەها یاسای ژمارە (٧٧)ی ساڵی ١٩٨٣ لەژێر ناونیشانی مافی ژنی تەلاَقدراو لە نیشتەنیدا چارەسەری مەسەلەی دابینکردنی نیشتەنی بۆ ژنی تەلاَقدراو کردووە.

ئەمەی خوارەوە دەقی ماددەی (١)ی ئەم یاسایەیە: ((ئەو دادگایەی سەیری داوای تەلاَق یان جیابوونەوەی ژن دەکات، لەسەر داوای ژنەکە بڕیار دەدات کە ژنە تەلاَقدراوەکە یان جیابووەکە بەبێ مێردەکەی لەناو ئەم خانووە یان شقەیە بمێنێتەوە کە هی مێردەکەیەتی، وە ئەم بڕیارەش لەگەڵ حوکمی تەلاَقەکە یان جیابوونەوەکە دەردەچێت)).

## هەڵوێستی یاسادانەری کوردستانی:

پەرلەمانی کوردستان بە یاسای ژمارە (٨)ی ساڵی ٢٠٠١ لە ماددەی یەکەمدا مافی قەرەبووکردنەوەی بەخشیوە بە ژن ئەگەرهاتوو مێردەکەی بە زوڵم تەلاَقی بداتو لە ئاکامیشدا زەرەرمەند بووبێت، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((ئەگەر مێردێ ژنەکەی تەلاَق داو، دادگا بۆی دەرکەوت کە مێردەکە بە زوڵم تەلاَقی داوەو بەو تەلاَقدانەش ژنەکەی زەرەرمەند کردووە، ئەوە، لەو بارەدا، دادگا لەسەر داوای ژنەکە حوکمێکی ئەوتۆ بەسەر مێردەکەدا دەدات کە لەگەڵ باری دارایی‌و

گوزەرانو پلەی زوڵمەكەیدا بگونجیو زەرەرەكان سەرجەم خەملێ دەكرێن بە مەرجێ سەرەڕای مافە چەسپاوەكانی دیكەی ژنەكە نەفەقەكەشی لەماوەی دوو ساڵ كەمتر نەبیو لە (٣) ساڵیش تێنەپەڕی)) [١].

**دووەم: جیابوونەوە (التفریق)**

١- جیابوونەوەی ڕەزامەندیانە

پەیوەندی ژنو مێردایەتیش وەكو گشت پەیوەندییە مرۆڤایەتیەكانی تر بێ كێشە نییە. هەڵبەتە هەندێك جار ئەو كێشانە دەبنە مایەی تێكچوونی ئەو ئەو پەیوەندییە، ئەویش بە سێ ڕێگا دەبێ.

لە ڕێگای تەلاقدانەوە لەلایەن پیاوەكە یان ژنەكە ئەگەر مافی تەلاقخستنی لە دەست دابێ یان لە ڕێگای جیابوونەوەی دادگەیی یان جیابوونەوەی ڕەزامەندیانە دەبێ.

ئێمە بەلامانەوە پەیوەندی ژنو مێردایەتی زۆر پیرۆزەو داكۆكی لێدەكەین، بەلام ئەگەر هۆیەكی ڕەوا بۆ لابردنی ئەم پەیوەندییە بێتە ئاراوە ئەوكاتە لاریمان لەبارەیەوە نابێ، بەلام بۆ بەرژەوەندی هەردوو لایەنەكە (ژنو مێرد) هەروەها بۆ بەرژەوەندی كۆمەڵیش واچاكە تاكو ڕێگەی باشو ئاسان هەبێ، ڕێگای دوورو درێژ نەگیرێتەبەر، لەبەر ئەوە ڕێگەی سێیەم واتە كجیابوونەوەی ڕەزامەندییانە باشترین ڕێگەیە بۆ ئەم كجیابوونەوەیە.بۆیە ئێمەش بە پێویستمان زانی باس لە

---

[١] - بڕوانە ڕۆژنامەی وەقایعی كوردستان ژمارە (١٩)ی ساڵی ٢٠٠١/٨/١.

جیابوونەوەی ڕەزامەندییان بەپێی یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ بکەین.

یاسای ناوبراو مادده (٤٦) ی بۆ ڕێکخستنی حوکمەکانی ئەم جیابوونەوەیە تەرخان کردووە، کە ئەمە دەقەکەیەتی: ((١- لێکجیابوونەوەی ڕەزامەندیانە بریتیە لە هەڵگرتنی کۆتی ژنو مێردایەتی بە لەفزی کجیابوونەوەی بە خوایشت یان هەر لەفزێك ئەم مانایە بدا بە دەستەوە، وە ئەمەش بە کۆکبوونی ئارەزووی هەردوو لایەنەکە لەبەردەم دادگا ئەنجام دەدرێ، بەڵام دەبێ حوکمەکانی ماددەی (٣٩) ی ئەم یاسایە ڕەچاو بکەن.

٢-بۆئەوەی کجیابوونەوە ڕەزامەندیانەکە ڕاستو دروست بێ، دەبێ مێردەکە لێهاتووی (أهلیة) تەلاقخستنی هەبێت، هەروەها ژنەکە دەبێت ناوەڕۆکی (محل) ئەوەبێ، لەو حاڵەتەشدا تەلاقی جوداکەر (بائن) لە ژنو مێردەکە دەکەوێ.

٣-مێرد بۆی هەیە لە ژنەکەی جودا بێتەوە لە بڕی بەرامبەرێکی زۆر یان کەمتر لە مارەییەکەی)).

ئەوەی شایەنی باسە، لێکجیابوونەوەی ڕەزامەندیانە بە مانای ڕامالێنو لابردن دێ، واتە لابردنو ڕامالێنی پەیوەندی ژنو مێردایەتی لە بڕی بەرامبەرێك کە ژنەکە دەیگرێتە ئەستۆی خۆی.

بۆ نموونە، مێردێك بە ژنەکەی دەڵێ: بە خوایشت لێت جیادەبمەوە بەرامبەر یەك ملیۆن دینار، ژنەکەش دەڵێ قەبووڵمە.

لەم دەقەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە بۆ کجیابوونەوەی ڕەزامەندیانە سێ مەرج پێویستە هەبێ کە ئەمانەن:

١-بەکارهێنانی لەفزی جیابوونەوەی ڕەزامەندیانە (التفریق الاختیاري) یان هەر لەفزێکی تر کە ئەو مانایە بدات بە دەستەوە وەکو لەفزی گەردەن ئازادکردن (الابراء).

٢-نواندنی ڕەزامەندی لەلایەن هەردوو لاوە.

٣-دەبێ کجیابوونەوە ڕەزامەندییەکە لەسەر بڕێك دارایی بێت، ژنەکە دەیداتە مێردەکە. بەبێ بژاردنی ئەم بەرامبەرە لە لایەن ژنەوە جیابوونەوەکە بە جیابوونەوەی ڕەزامەندیانە لە قەڵەم نادرێ، هەرچەندە لەفزی ڕەزامەندیانەش بەکارهاتبێ.

ئەگەر ڕوداوی جیابوونەوەکە ئەم سێ مەرجانەی سەرەوەی تیا بوو، ئەوا لێکجیابوونەوەکە بە جۆری جیابوونەوەی ڕەزامەندیانە دادەنرێتو دەرئەنجامە یاساییەکەشی ئەمەی خوارەوە دەبێ.

أ-کەوتنی تەلاق.

ب-جۆری تەلاکە جوداکەر (بائن) دەبێ.

ج-ئەو بەرامبەرەی کە ژنو مێردەکە لەسەری ڕێککەوتوون دەکەوێتە ئەستۆی ژنەکەو دەبێ بیداتە مێردەکە.

## جیابوونەوەی دادەوەری (التفریق القضائي)

یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە (١٨٨) ی ساڵی ١٩٥٩ ماددە(٤٠) ی بۆ جیابوونەوەی دادەوەری تەرخانکردووەو مافی داوە بە هەریەکێك لە هاوسەرەکان (ژنو مێرد) داوای جیابوونەوە بکەن لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا:

أ- جیابوونەوە بەهۆی زیان پێگەیشتن

بەپێی بڕگەی یەکی ماددە(٤٠) ی یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە (١٨٨) ی ساڵی ١٩٥٩ هەردوو هاوسەر (ژنو مێرد) بۆیان هەیە لە ڕێگای دادگاوە دەست لە یەکتری بەربدەن، ئەگەرهاتوو یەکێك لەو مەرجانەی بڕگەی (١،٢،٣،٤،٥)ی ماددەی ناوبراو لەئارادابوو.

بەپێی بڕگەی یەك لە ماددەی ناوبراو ئەگەر یەکێك لە دوو هاوسەرەکان زیانی بە ئەوی تر گەیاند بە مەرجێك ئەو زیان پێگەیاندنە ببێتە بەربەستێك لە بەردەم ژیانی ژنو مێردایەتیەکە، ئەوا هاوسەرە زیان پێگەیشتووەکە بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بەهۆی ئەم زیان پێگەیشتنە بۆ دادگا بەرزبکاتەوەو بڕیاری دادگاش لەم بارەیەوە کۆتاییە.

بۆ نموونە، ئەگەرهاتوو پیاوێك تۆمەتی داوێن پیسی بخاتە پاڵ هاوسەرەکەی وەیان پێی بڵێ تۆ دۆستت هەیە وەیان پێی بڵێ تۆ کچ نیتو پەردەی کچێنیت نەماوە، ئەمەو هەر تۆمەتێکی تر لەو بابەتانە ئەوا لەو حاڵەتەدا ئەو هاوسەرە بۆی هەیە دوای سەلماندنی پاکی خۆی لەو تۆمەتانەی کە لەلایەن هاوسەرەکەیەوە بۆی هەڵبەسترابوو ڕوو لە دادگا بکاتو داوای جودابوونەوە بەهۆی ئەو زیانە لە هاوسەرەکەی بکات، بۆ ئەم مەبەستەش دادگا دوای گوێگرتن لە ناوبژیوانان کە لەلایەن ئەوەوە بۆ لەیەك نزیك بوونەوەی هەردوو هاوسەر لە یەکتریو ڕوونکردنەوەیو دیارکردنی کەمتەرخەمی هەرلایەك لە لایەنە ناکۆکەکان دادەندرێ ئەوا بڕیار لەسەر جیابوونەوەکە دەدات، بۆ نموونە لە حاڵەتەکەی پێشوو ئەگەرهاتوو ئافرەتەکە بۆ دادگای سەلماند لە ڕێگای لیژنەی پزیشکی داد (طب عدلي) و ڕاپۆرتی پزیشکی کە پەردەی کچێنی ماوەو خۆی نەدۆڕاندووە ئەوا دەبێتە خاوەن مافو داواکەی پەسند دەکرێت، وە بە پێچەوانەشەوە ئەوا داواکەی ڕەت دەبێتەوە.

لەڕاستیدا، ئەگەرهاتوو پیاوەکە لەلایەن دادوەری سزادان بەردراو هیچ تۆمەتێکی سزایی نەخرایە پاڵ بەهۆی نیازپاکی نزمی ئاستی خوێندنو پلەی ڕۆشنبیری هاوسەرەکە ئەوە نابێتە هۆیەك بۆ ڕەتکردنەوەی داوای ئافرەتەکە بۆ جیابوونەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە ژنەکە سەرەڕای بەرەللاّ بوونو ئازادبوونی مێردەکەی لەو تۆمەتە بۆی هەیە سووربێت لەسەر داوای جیابوونەوە، چونکە ئەو تۆمەتەی مێردەکەی خستوویەتە پاڵی، بێگومان زیانێکی زۆری بە شەرەفو نامووسی ئەو ژنە گەیاندووە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەسە بۆ پێدانی ئەم مافە پێی.

بەهەرحاڵ، جیابوونەوەی دادگەیی بەهۆی زیان پێگەیشتن بەپێی بڕگەی (١)ی ماددەی ناوبراو جیابوونەوەی جوداکەرە (بائن)و جۆرەکەشی جووداکەری بچووکە(بینونة صغری) واتە هەردوو هاوسەر بۆیان نیە بەبێ ڕێککەوتنێکی نوێ بچنەوە لای یەك.

ئەمەی خوارەوە دەقی بڕگەی یەك لە ماددە (٤٠)ی یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە ١٨٨ی ساڵی ١٩٥٩ یە سەبارەت بە جیابوونەوە بەهۆی زیان پێگەیشتن: ((هەریەکێك لە هاوسەرەکان بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات ئەگەرهاتوو یەکێك لەو هۆیانەی خوارەوە لە ئارادا بوو:

١–ئەگەرهاتوو یەکێك لە هاوسەرەکان زیانی بەوەی تر گەیاند، زیانێك بەردەوام بوونی ژیانی ژنو مێردایەتی لەگەڵدا زەحمەت بێت)).

هەروەها لە ماددە (٤٥)ی هەمان یاسادا هاتووە: ((جیابوونەوە لەو حاڵەتانەی کە لە ماددە(٤١،٤٢،٤٣) دا هاتووە جیابوونەوەی جووداکەری بچووك دەبێ)).

ئەوەی شایەنی باسە، لە بڕگەی (٢)ی ماددەی (٢٨)ی یاسای ناوبراودا پێناسەی جیابوونەوەی جووداکەری بچووك کراوەو تیایدا هاتووە: ((جووداکەری بچووك ئەو

حاڵەتەیە کە تیایدا ڕێگا بە مێردەکە دراوە ژنە تەلاّق دراوەکەی بە ڕێکەوتنێکی تری نویێ بهێنێتەوە)).

**ب–جیابوونەوە بەهۆی خیانەتی هاوسەرێتی**

خیانەتی هاوسەرێتی (الخیانة الزوجیة) بەو حاڵەتە دەوترێ کە تیایدا یەکێك لە هاوسەرەکان داوێن پیس بێتو لەگەڵ کەسانی تر جووت بێت.

ئەوەی شایەنی باسە، زاراوەی خیانەتی هاوسەرێتی لە ساڵی ١٩٨١ لە ئاکامی حەوتەمین گۆڕانکاری لە یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە ١٨٨ ی ساڵی ١٩٥٩ بۆ یەکەمین جار خرایە سەر ماددەی (٤٠) لە یاسای ناوبراو وەك هۆیەك لە هۆیەکانی جیابوونەوەی دادگەیی.

پێش ئەم گۆڕانە زاراوەی داوێن پیسی (زنا) بەکاردەهات لەکاتێکدا ئەگەر ژنەکە لەماڵەوە وەیان لە دەرەوە ئەم داوێن پیسییەی بکردبایە دەبووە هۆیەك لە هۆیەکانی جیابوونەوەی دادگەیی کەچی ئەگەر پیاوەکە لە دەرەوەی ماڵی خۆی ئەم کارەی ئەنجام بدابا بە داوێن پیس لە قەڵەم نەدەدراو ژنەکەشی بۆی نەبوو بەم بیانووە داوای جیابوونەوە لە دادگا بکات.

لەبەر ئەم هۆیەو بۆ نەهێشتنی ئەم کەموکوڕییە لە یاسای ناوبراودا یاسادانەر لە حەوتەمین هەمواریدا زاراوەی خیانەتی هاوسەرێتی لەجیاتی زینا بەکارهێناو بەم پێیە ژن وەیان پیاو ئەگەر داوێن پیسی بکات واتە سێکسکردن لەگەڵ کەسانی تر لە ماڵەوە وەیان لە دەرەوەی ماڵی خۆیان ئەوا بۆ هاوسەرە زیانپێگەیشتووەکە هەیە داوای جیابوونەوە لە هاوسەرە داوێن پیسەکەی بکات لەبەر ئەم هۆیە.

لە ڕاستیدا ئامادەبوونی ژن لەگەڵ پیاوی بێگانە لە ژووری خەوتن بەسە بۆ خستنە پاڵەوەی تاوانی داوێن پیسی بۆی، بۆیە سەرەڕای ئازادکردنی ژنەکە لە

لایەن دادوەری لێکۆڵینەوە لەبەر ئیکتیفا نەبوونی بەڵگەکان بۆ حوکمدانی ژنەکە بە تاوانی زینا بەپێی ماددەی (٣٧٧) ی یاسای سزاکانی عیراقی ژمارە (١١١) ی ساڵی ١٩٦٨ پیاوەکە بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بۆ دادگا بەرزبکاتەوەو بەهۆی خیانەتی هاوسەرێتی دەستی لێ بکاتەوە.

ئەمەی خوارەوە دەقی ماددەی (٤٠)ی یاسای باری کەسی عیراقی ناوبراوە سەبارەت بە جیابوونەوەی دادگەیی بەهۆی خیانەتی هاوسەرێتییەوە.:

(( ١-ئەگەرهاتوو یەکێك لە هاوسەرەکان زیانی بە هاوسەرەکەی تر گەیاند، زیانێك کە بەردەوام بوونی ژیانی ژن‌و مێردایەتی لەگەڵیدا زەحمەت بێت.

٢-ئەگەر هاوسەرەکەی تر خیانەتی هاوسەرێتی کرد وە بە خیانەتی هاوسەرێتی دادەندرێ ئەنجامدانی کرداری لوواتە (اللواط) لەلایەن مێردەکەوە بەهەر شێوەیەك لە شێوەکان. مەبەستمان ئەوەیە چ مێردەکە مناڵبازی بکات یان ئەوکردارە لەگەڵ ژنەکەی خۆی بکات بەبێ ڕەزامەندی ئەو.

### هەڵوێستی یاسادانەری کوردستانی:

پەرلەمانی کوردستان بە یاسای ژمارە (٩)ی ساڵی ٢٠٠١ لە ماددەی دووەمیدا حوکمی بڕگە/٢ ی ماددەی/٣٧٧ ی یاسای سزاکانی عیراقی ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ ی هەموارکراوی لەکارخستووەو[1]

---

[1] - ئەمەش دەقی ماددە/٣٧٧ی یاسای سزاکانی عیراقی یە: ((١- ژنی داوێن پیس هەروەها ئەو کەسەش کە داوێنپیسی لەگەڵدا کردووە بە حەپسکردن سزا دەدرێن‌و ئەگەری ئەوە دەکرێ کە تاوانبار زانیویەتی کە ژنەکە

سزای مێردی داوێنپیس و ئەو ئافرەتەی کەداوێنپیسییەکەی لەگەڵ کردووە هاوتا کردووە لەگەڵ سزای ژنی داوێنپیس و ئەو پیاوەی داوێنپیسییەکەی لەگەڵ کردووە، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((مێردی داوێن پیس (الزاني) و ئەو ئافرەتەش کە داوێن پیسییەکەی لەگەڵ کردووە. هەر بەو سزایە حوکم دەدرێن کە لە بڕگە (١)ی ماددەی (٣٧٧)ی یاسای سزاکانی ژمارە (١١١)ی هەموارکراوی ساڵی (١٩٦٩)دا هاتووە))[١].

## ج- جیابوونەوە بەهۆی بەجێهێشتن

بەپێی بڕگەی یەکەم -دوو- لە ماددەی (٤٣) ی یاسای باری کەسیی عێراقی کارپێکراو ژن بۆی هەیە داوای جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات ئەگەهاتوو هاوسەرەکەی بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ بەبێ عوزری شەرعی بەجێی هێشتبێت کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((یەکەم: ژن بۆی هەیە داوای جیابوونەوە بکات ئەگەرهاتوو یەکێك لەم هۆیانەی خوارەوە لەئارادا بوو:

١-ئەگەر مێردەکە سزایەکی ئازی ستێن درا بۆ ماوەی سێ ساڵ و زیاتر هەتا ئەگەر دەرامەتێکی واشی هەبێت ژنەکەی بتوانێت لێی خەرج بکات.

٢-ئەگەر مێردەکە ژنەکەی بۆ ماوەی دوو ساڵ و پتر بەبێ هۆیەکی شەرعی بەجێ هێشت، هەتا ئەگەر شوێنی نیشتەجێ بوونی مێردەکە دیاربوو دەرامەتێکی واشی هەبێت کە ژنەکە بتوانێت لێی خەرج بکات....)).

---

هاوسەرگیرە مەگەر ئەوە بسەلمێنێ کە بەعیچ شێوەیەك لەتوانایدا نەبووە ئەوە بزانێ. ٢- مێرد هەمان سزای بەسەردا دەسەپێندرێت ئەگەرهاتوو لە شوێنی حەوانەوەی هاوسەرەکەی داوێنپیسی بکات)).

[١] - بڕوانە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان ژمارە (١٩)ی ساڵی ٢٠٠١/٨/١.

لەم دەقەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بەجێهێشتنی ژن لەلایەن مێردەکەیەوە دەبێتە هۆی جیابوونەوە.

بەم پێیە ئەو ژنەی کە مێردەکەی بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ بەبێ عوزری شەرعی بەجێی هێشتبێت بۆی هەیە ڕوو لە دادگا بکاتو داوای جیابوونەوە لە هاوسەرەکەی لە دادگا بکات. ئەمەو دیاربوونی جێگاو ڕێگای مێردەکە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێتو نابێتە بەربەستێك لەبەردەم مافی ژنەکە بۆ ئەم جیابوونەوەیە.

زیاتر لەمەش بوونی پارەو پوولو سوود وەرگرتنی ژنەکە لە پارەو پوولی مێردەکەی لەو ماوەیەدا دیسان هیچ گرفتێك بۆ مافی ژنەکە دروست ناکات.

کەواتە ئەگەرهاتوو پیاوێك ژنی خۆی بەجێ بهێڵێ هەرچەندە شوێنی دانیشتنەکەی دیاربێتو لە هەمان شاری دانیشتنی ژنەکەی بێت بە تێپەڕبوونی زیاتر لە دوو ساڵ بەسەر ئەم بەجێ هێشتنە مافی داوای جیابوونەوە بە ژنەکەی دەبەخشرێتو ژنەکەی بۆی هەیە داوای جیابوونەوە لە دادگا بکات هەروەها داوای بژێوی ژیانی بکات بۆ ماوەی ڕابردوو .

شایەنی باسە، ئەگەرهاتوو مێردەکە لە ماوەی بەجێهێشتنەکەدا جاروبار سەردانی ژنەکەی کردبێت بەڵام ئەم سەردانەی لەلایەن ژنەکەیەوە پەسند نەکرابێتو لەماڵەوە دەرکرابێت بەهۆی ئامادەنەکردنی ماڵی شەرعی لەلایەن مێردەکەوە نابێتە هۆی بە درۆخستنەوەی بەجێهێشتنەکە چونکە پێویستە لەسەر پیاوەکە ماڵی شەرعی بۆ ژنەکەی ئامادە بکات ئەوجا داوای گەڕانەوە لە ژنەکەی بکات وە بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ مێردەکە بڕیاری دادگای بۆ گوێ ڕایەڵی (مطاوعة)

بەدەستەوە بێ ئەوجا دەتوانێ داوای پچڕاندنی ماوەی بەجێهێشتنەکە (قطع الهجر) بکات.

بەهەر حالێ، جیابوونەوە بەهۆی بەجێهێشتن بەپێی برگەی یەك لە ماددەی ناوبراو بە پالێ پشتی ماددەی چلو پێنج لە هەمان یاسادا دەردەچێ.

وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە جیابوونەوەکە جووداکەرەوەی بچووکە (بینونە صغری) واتە مێردەکە تەنها تەلاَقێکی دەکەوێتو بۆی هەیە بەپێی ڕێککەوتنێکی نوێ ژنەکەی بۆ لای خۆی بگەڕێنێتەوە.

### د- جیابوونەوە بەهۆی ژن بەسەرهێنان

ژن بەسەرهێنان بەپێی یاسای باری کەسیی عیراقی کارپێکراو پێش هەموارکردنی ژمارە (٢١)ی سالّی ١٩٧٨ شتێکی ئاسایيو ڕەوا بوو بۆ پیاو، بەلاَم دوای ئەم گۆڕانکارییەی لە ١٩٧٨/٢/٢٠ کە بە سەریداهات بووە هۆیەك لە هۆیەکانی لێکجیابوونەوەو مافی داوای جیابوونەوەی بە ژن بەخشی.

بۆیە بەپێی برگەی/٥ لە ماددەی (٤٠) لە یاسای ناوبراو ژن بۆی هەیە داوای جیابوونەوە لە مێردەکەی بکات ئەگەرهاتوو بەبێ ڕەزامەندی ئەو وەیان دادگا ژنی بەسەرهێنا. ئەمەش دەقەکەیەتی:((هەریەکێك لە هاوسەرەکان بۆیان هەیە داوای جیابوونەوەو دەستلێکبەردان بکەن ئەگەر هۆیەك لەم هۆیانەی خوارەوە لە ئارادا بوو:

٥-ئەگەر مێردەکە ژنی دووەمی بەبێ ڕەزامەندی دادگا هێنابێت، لەو حالّەتەشدا ژنەکە مافی بەرزکردنەوەی داوای سزایی نییە بەپیی برگەی (١)ی بەندی (أ) لە

ماددەی سێیەم لە یاسای بنەماکانی دادبینی سزایی ژمارە (٢٣) ی ساڵی ١٩٧١ پشت بەستوو بە بڕگەی (٦) ی ماددە (٣) ی ئەم یاسایە)).

ئەوەی شایەنی باسە، ئەگەر جیابوونەوەکە بەپێی ئەو ماددەیەی سەرەوە ئەنجام درا ئەوا بە جیابوونەوەی جووداکەرەوەی بچووك هەژمار دەکرێت‌و بەپێی حوکمەکانی ماددەی (٤٥) لە هەمان یاسادا، واتە دەبێ ژنەکە سێ خاوێنی لە دوای بێنوێژییەکانی ببینێ ئەوجا بۆی هەیە بە ڕێکەوتن‌و مارەیێکی نوێ بچێتەوە لای مێردەکەی. ئەمەش دەقەکەیەتی: ((جیابوونەوە لەو حاڵەتانەدا کە لە ماددەکانی (٤٠،٤١،٤٢،٤٣) هاتووە بە جیابوونەوەی جوداکەرەوەی بچووك دادەندرێ)).

لە ڕاستیدا، یاسادانەری عێراقی هەر بەمەندە نەوەستاوە بەڵکوسزاشی بۆ ئەو هاوسەرە داناوە کە بەبێ ڕەزامەندی ژنەکەی وەیان ڕەزامەندی دادگا ژن بەسەر هاوسەرەکەی دابێنێ. بۆیە بەپێی ب بۆگەی شەش لە ماددەی (٣) ی یاسای ناوبراو ئەو پیاوەی پێچەوانەی بڕگەی (٤،٥) لە ماددەی ناوبراو ژنی دووەم بهێنێ ئەوا بە بەندی نشین بۆ ماوەیەك سزا دەدرێ کە لە ساڵێك زیاتر نەبێت یان بە غەرامەیەك کە لە سەد دینار زیاتر نەبێت وەیان بە هەردووکیان سزا دەدرێت.

هەرچەندە بەپێی حوکمەکانی ماددەی (٣) بڕگەی (٦) ئەو هاوسەرەی ژنی دووەم بەبێ ڕەزامەندی دادگا بهێنێ سزای لەسەر دەبێ بەلاّم ئەم حوکمە ڕەها نیە، بەڵکو پابەندی شتێکی ترە ئەویش ئەوەیە کە ئایا ژنەکە داوای سزادانی مێردەکەی کردووە یان داوای جیابوونەوەی کردووە؟ یان داوای هەردووکیانی کردووە؟

لە ڕاستیدا، ژنەکە بۆی نیە سوود لە هەردوو مافە لە یەك کاتدا ببینێ، بەڵکو دەبێ تەنها یەکێکیان بۆخۆی هەڵبژێرێ، بۆیە ئەگەرهاتوو ژنەکە داوای

جیابوونەوەی بۆ دادگا بەرز کردبۆوە، بەهۆی ژن بەسەرهێنان، ئەوا بۆی نیە داوای سزادان بۆ دادگا لەبەر هەمان هۆ بەرزبکاتەوە.

هەروەها ئەگەرهاتوو داوای سزادانی بۆ دادگا بەرزکردبێتەوەو دوایش داوای جیابوونەوەی کردبێت ئەوا لەوحاڵەتەدا دەبێ دادگا داوا سزاییەکەی ڕەت بکاتەوە.

بەرزکردنەوەی داوای سزایی بەپێی ماددەی (٣) بڕگەی (أ) لە یاسای دادبینی سزایی ژمارە (١٢٣) ی ساڵی ١٩٧١ تایبەتە بە ژنەکەوە یان ئەو کەسەی بەپێی یاسا جێگای دەگرێتەوە.

واتە تەنها ژنەکە بۆی هەیە ئەم داوایە بۆ دادگا دژی مێردەکەی بەرزبکاتەوەو کەسی تر ئەو مافەی نیە مەگەر بەپێی یاسا نەبێ.

شایەنی ووتنە، بەپێی بڕگەی (٧) لە ماددەی (٣) لە یاسای باری کەسی عیراقی ناوبراو پیاو دەتوانێ لە ژنێك زیاتر بهێنێت ئەگەرهاتوو مەبەست لە ژن هێنانەکەی هێنانی بێوەژنێك بێت. هەروەها ئەگەرهاتوو پیاوەکە دەستی لە ژنی دووەم بەردا ئەوا ژنی یەکەم بۆی نیە داوای لێکجیابوونەوە لە مێردەکەی بکات.

## هەڵوێستی یاسادانەری کوردستانی:

پەرلەمانی کوردستان بەپێی یاسای ژمارە (٦)ی ساڵی ٢٠٠١حوکمێکی پێچەوانەی یاسادانەری عیراقی داوە لەبارەی ژن بەسەرهێنانەوەو سزای سێ تا پێنج ساڵی بۆ پیاوی سەرپێچیکار بڕیوەتەوە بەپێی ماددەی یەکەم کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((هەروەها لەجیاتی سەرپشککردنی ژن بۆ هەڵبژاردنی بژاردەیەك لەو دوو بژاردەیە (جیابوونەوە بەهۆی ژن بەسەرهێنان یان سزادانی مێردەکەی))،

مـافی ئـەوەی پـێ داوە کـە داوای هـەردوو بـژاردە لـە دادگـا بکـات، واتـە داوای جیابوونەوە لە مێردەکەی بکاتو لە هەمان کاتیشدا داوای سزادانیشـی بکـات بـەو هۆیەوە))[1]. ئەمەو بە یاسای ژمارە (١٠)ی ساڵی ٢٠٠١ یاسای ژمـارە ١٨٩ی سـاڵی ١٩٨٠ ی عیراقی لەکار خستووە کەتایبەتـە بـە ڕێگـادان بـە مێـرد کـە ژنـی دووەم بەبێ ئیزنی دادگا بهێنێ ئەگەر بێوەژن بێت))[2].

**هـ- وەرگرتنی حوکمی دادگا بۆ خستنی تەڵاق یان تۆمارکردنی**

یاسـادانەری عێراقـی لـە برگـەی یەکـەم لـە مـاددەی ٣٩ی یاسـای بـاری کەسـیدا جەختی کردۆتەوە لەسەر دەسەڵاتی دادگا لە سـەر خسـتنی تـەڵاقو تۆمارکردنیـدا کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

((١- هەرکەسێك بیەوێت ژنەکەی تەڵاق بدات پێویسـتە داوایـەك لـە دادگـای بـاری کەسـێتی بەرزبکاتــەوەو تیایـدا داوای کـەوتنی تەڵاقەکـە بکـاتو بڕیـاری دادگـای لەسەر وەربگرێت. ئەگەر نەتوانێت سـەر لـە دادگـا بـدات، پێویسـتە تەڵاقدانەکـەی لەماوەی عیددەدا لە دادگا تۆمار بکات)).

گومـانی تیانیـە، مەبەسـتی یاسـادانەر لێـرەدا ئاراسـتەکردنی هاوڵاتیانـە بـۆ خۆبەدوورخستن لە خستنی تەڵاق لە دەرەوەی دادگا، چونکە لەوانەیە لە ئەنجامی پاڵپەستۆیەکی نائاسایی یان تووڕەبوون یـان بـەبێ مەبەسـت ئـەم کـارە ئـەنجام بداتو لە ئاکامیشدا پەشیمان دەبێتـەوە. بـەڵام ئەگـەر بـۆ ئـەم مەبەسـتە ڕوو لـە

---

[1] - بڕوانە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان ژمارە (١٩)ی ساڵی ٢٠٠١/٨/١

[2] - بڕوانە ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان ژمارە (١٩)ی ساڵی ٢٠٠١/٨/١

دادگا بکات ڕەنگە ئەو پاڵەپەستۆیەی لەسەر بووە لەگەڵ تووڕەبوونەکەشی کەم بێتەوە یان نەمێنێو لە بڕیاری تەڵاقەکەی پەشیمان بێتەوە، بە پێچەوانەشەوە سوربون لەسەر تەڵاقدان نیشانەی ئەوەیە کە مەبەستییەتی کۆتایی بەو پەیوەندییە هاوسەرگیرییە بهێنێن جا لەبەر هەر هۆیەك بێت.

هەرچەندە لێرەشدا تا ڕادەیەك دادگا ڕۆڵی پۆزەتیڤانەی خۆی دەبینێت لە پەشیمانکردنەوەی مێردەکەو درێژکردنەوەی ئەو پەیوەندییە هاوسەرگیرییە بە درێژەپێدانی دانیشتنەکانی دادگاو هێنانە ناوەوەی ناوبژیوانانو توێژەری کۆمەڵاتی بۆ نێوانیان.

**سەرچاوەكان:**

١- قورئانی پیرۆز
٢- د . احمد على و الآخرون : شرح قانون الاحوال الشخصية ، وزارة التعليم العالى و البحث العلمى ، ط/١، سنة ١٩٨٠.
٣- د . عبد الرحمن الصابونى : شرح قانون الاحوال الشخصية الورى ، مديرية الكتب الجامعية ، بلا سنة الطبع.
٤- فريد فتيان: شرح قانون الاحوال الشخصية، ط / ٢، دارواسط ، لندن ١٩٨٦.
٥- نظام الدين عبدالمجيد، احكام الاسرة في فقه الاسلامي، احكام النكاح، ط/١، مطبعة جامعة يغداد، ١٩٨٦.
٦- د . عبدالرزاق النسنهوري : الوسيط، ج/١
٧- د.عبدالمجيد الحكيم واخرون: الوجيزفي نظرية الالتزام في القانون المدني العراقي، ج/١، منشورات جامعة بغداد، ١٩٨٦.
٨- المستشار حاتم صبحي الأرناؤوطي: موسوعة الأذونين الشرعيين والموثقين المنتدبين، منشورات دار الكتب القانونية، مصر، ٢٠١٠.
٩- محمد مصطفى شلبي: احكام الاسرة في الاسلام، ط/١، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٩٧
١٠-د.مصطفى السباعي: شرح قانون الاحوال الشخصية، ج/١، الزواج وانحلاله، دار الوراق للنشر والتوزيع، دمشق، ٢٠٠١
١١- البروفيسور الدكتور مصطفى ابراهيم الزلمي: الطلاق مرتان في تفاسير القرآن، ط/٣، ٢٠١١
١٢-الدكتور مصطفى الزلمي: الطلاق المقترن بالعدد لايقع به الا طلقة واحدة، بلا جهة النشر وسنة النشر

١٣- دکتۆر موستەفا ئیبراهیم زەڵمی: کاروانی ژیانم، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ٢٠١٤.

١٤- یاسای باری کەسی عیراقی ژمارە ١٨٨ ی ساڵی ١٩٥٩ی هەموارکراو.

١٥- یاسای شارستانی عیراقی ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١.

١٦- یاسای سزاکان ژمارە (١١١)ی ساڵی ١٩٦٩ هەموارکراوە

١٧- مجلة الاحکام العدلیة ژمارە (١) ی ساڵی ١٩٧٨

١٨- مجلة الاحکام العدلیة ژمارە (٤) ی ساڵی ١٩٧٥

١٩- مجلة النشرة القضائیة ساڵی ١٩٧٢

٢٠-(الوقائع العراقیة) ژمارە ٢٧٥٨ ڕۆژی ١٩٨٠/٢/٢٥

٢١- ڕۆژنامەی وەقایعی کوردستان ژمارە (١٩)ی ساڵی ٢٠٠١/٨/١



# ژیاننامەی
# پرۆفیسۆر دکتۆر کەمال سەعدی مستەفا

پۆستی ئەلیکترۆنی: dr.kamal_56@yahoo.com

ژمارەی تەلەفۆن: 1658 449 770 964 +

ناونیشانی مال: گەڕەکی ڕاستی، هەولێر، هەرێمی کوردستان، کۆماری عێراقی فیدرال.

سالو شوێنی لە دایك بوون: ١٩٥٦/٧/١ هەولێر

شوێنی وەزیفە: زانکۆی سەلاحەددین–هەولێر/ کۆلێژی یاساو ڕامیاری

مەرکەزی وەزیفی: مامۆستا

نازناوی زانستی: مامۆستا لە ڕێکەوتی ٢٠٠٢/٩/١٠ بەپێی فەرمانی زانکۆیی کە دەرچووە لە سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر ژمارە ٢٥٢٣/١/١ لە ٢٠٠٣/٥/٣.

نازناوی زانستی: پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە ڕێکەوتی ٢٠٠٦/٩/١٠ بەپێی فەرمانی زانکۆیی کە دەرچووە لە سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر ژمارە ١٧٢١٤/١/١ لە ٢٠٠٧/٩/٢٢.

نازناوی زانستی ئێستای: پرۆفیسۆر لە ڕێکەوتی ٢٠١٣/٧/٢٠ بەپێی فەرمانی زانکۆیی کە دەرچووە لە سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین هەولێر ژمارە ٩٧٨٠/١/١ لە ٢٠١٤/٧/٢٣.

دوا بڕوانامە: دکتۆرا .

ناونیشانی تێزی دکتۆرا: (چوارچێوەی یاسایی ئازادی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا).

ولاَتو زانکۆ کە بڕوانامەی پێ بەخشیوە: زانکۆی سەلاحەددین–هەولێر/ کوردستان/ عێراق لە ٢٠٠٣/٧/٧

پسپۆری گشتی: یاسای گشتی

پسپۆری ورد: یاسای نێودەوڵەتیو دەستووری.

مێژووی دامەزران: بۆ یەکەم جار لە ١٩٧٦/٦/١٣ تا ساڵی ١٩٩٠ دواتر خانەنشین بووە. دواتر جارێکی ترگەڕاوەتەوە وەزیفەو لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە ١٩٩٦/٤/٢٥ بە ناونیشانی مامۆستای یاریدەدەر دامەزراوەتەوە.

شوێنو مێژووی وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس: زانکۆی سەلاحەددین–هەولێر/ کوردستان/ عێراق لە ساڵی خوێندنی ١٩٨٩/١٩٨٨ .

ناونیشانی ماستەرنامە: حق الملكية الادبية والفنية في القانون العراقي والمقارن.

شوێنو مێژووی وەرگرتنی: زانکۆی سەلاحەددین–هەولێر/ کوردستان/ عێراق لە ١٩٩٦/٥/٢١.

## ئەو پۆستانەی وەریگرتوون:

- بڕیاردەری بەشی یاسا
- بەرپرسی یەکەی توێژینەوە لە ٢٠٠٣/٨/١٧.
- سەرۆکی بەشی یاسا (بەیانیانو ئێواران) لە ٢٠٠٥/٥/٤ تاکو ٢٠٠٧/٥/٢٥.
- ڕاگری کۆلێژی یاسا لە ٢٠٠٦٩/٢/١٢ تاکو ٢٠٠٦/٧/٢٨.
- ڕاگری کۆلێژی یاساو ڕامیاری لە ٢٠٠٦/٧/٢٨ تاکو ٢٠٠٨/٥/١٥.

- ڕاگری کۆلێژی پەروەردە بۆ زانستە مرۆڤایەتیەکان لە ٢٠٠٨/٢/١٥ تا ٢٠١٠/٨/١٠.

**ئەو لیژنانە زانستیانەی بەشداری تیا کردووە:**

- لیژنەی خوێندنی بالاً .
- لیژنەی ئەزموونەکان.
- لیژنەی بەخشینی پلەی زانستی.

**ئەو کۆنفرانسە زانستیانەی بەشداری تیا کردووە:**

- یەکەم کۆنفرانسی خوێندنی بالآی زانکۆکانی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٠ بۆ گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندنو سیستمی خوێندن.
- دووەم کۆنفرانسی خوێندنی بالآی زانکۆکانی کوردستان لە ساڵی ٢٠٠٦ بۆ گۆڕینی پرۆگرامەکانی خوێندنو سیستمی خوێندن.
- کۆنگرەی ئاو (هەولێر ١٤-١٤ مایس ٢٠٠١) سەنتەری برایەتی بە هاوکاری لەگەڵ ڕێکخراوی نێودەوڵەتی فاو.
- کۆنگرەی یەکەمی ڕاگرەکانی کۆلێژەکانی یاسا لە زانکۆکانی عێراق بۆ دیراسەکردنی خوێندنی یاسای مرۆڤایەتی نێودەوڵەتی ( بەسەرپەرشتی ڕێکخراوی خاچە سووری نێودەوڵەتی لە ئوردن- عەمان بەسترا) .
- کۆنگرەی ڕۆژنامەگەری ئازاد لە پێناوی عێراقی نوێدا لە هۆتێلی تاوەری هەولێر لە ڕێکەوتی ٢٧-٢٠٠٥/٤/٢٩ بەسترا.
- کۆنگرەی چوارەمی یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان لە شاری هەولێر لە ڕێکەوتی ٢٧-٢٠٠٤/١١/٢٨ بەسترا.

- کۆنگرەی مافپەروەرانی کۆماری عێراق لە شاری هەولێر لە سەنتەری ڕۆشنبیری زانکۆی سەلاحەددین لەساڵی ٢٠٠٤ بەسترا.
- کۆنگرەی دەستوورو ڕیفراندۆم لە شاری هەولێر لە ڕێکەوتی ٢٠٠٥/٩/٢٧ بەسترا.
- کۆنگرەی زانستی لە پێناو گەشەپێدان و سەقامگیرکردنی زمانی کوردی لە هەولێر لە ڕێکەوتی ٢٠٠٥/٧/١٥ بەسترا.
- یەکەم کۆنگرەی وەزارەتی کشتوکتڵی هەرێمی کوردستانی غێراق بۆ دانانی پلانی ستراتیژی بۆ وەزارەتی کشتوکاڵ لە هەولێر لە ڕێکەوتی ٣٠حوزەیران تا ١ تەموزی ساڵی ٢٠٠٧ بەسترا.
- کۆنفرانسی جیهانی مافەکانی مرۆڤ لە کوردستان لە هۆڵی هوتێتی خانزاد لە تەموزی ساڵی ٢٠٠٧.
- کۆنفرانسی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستانی غێراق بۆ هەڵسەنگاندنی خوێندنی مافەکانی مرۆڤ لە هەرێمی کوردستان هەولێر هوتێلی هەولێر پلازا – ١٧–١٨ تشرینی یەکەمی ٢٠١٢.

- **Human Rights Protection Training Agenda (May – 2001) Erbil**
- **Iraq –First Higher Education Conference In Kurdistan Region Erbil 21-23 APRIL 2001**
- **Conflict Resolution Curriculum Development Workshop University of Duhok 10-14 august 2003**

## ئەو کتابانەی کە دایناون لە بواری یاسابە زمانی کوردی:

- لێکدانەوەی یاسای بەکرێدان.
- چەمکی ماف – چاپی یەکەم + چاپی دووەم.
- چەمکی یاسا.
- حقوق المؤلف.
- یاساو ماف.
- مافی دانەر – وەرگێڕان، هاوبەش.
- دەسەڵاتی چوارەم.
- یاسای ڕۆژنامەگەری.
- چوارچێوەی یاسایی ئازادی ڕۆژنامەگەری لە کوردستانی عێراقدا.
- یاسای ڕۆژنامەگەری
- ئازادیی ڕۆژنامەگەریو ئەخلاقی پیشە.
- ئازادیی ڕۆژنامەگەری، ڕای گشتیو دیموکراسییەت.
- تاوانەکانی ڕۆژنامەگەری.
- فەلسەفەو یاسا لە چەند وتارێکدا.

## ئەو کتابانەی کە دایناون لە بواری یاسابە زمانی عەرەبی:

- الملكية الادبية والفنية.
- حقوق الانسان في المذاهب الفكرية.
- حقوق الانسان ومعاييرها الدولية.
- حقوق الانسان بين المواثيق الدولية و المذاهب الفكرية.

- حقوق الانسان.
- السلطة الرابعة.

ئەو کتابانەی کە دایناون لە بواری ئەدەب‌و ڕۆشنبیریدا:

- شەش کورتەچیرۆکی کوردی – هاوبەش لەگەڵ سابیر ڕەشید.
- ون بوون – کۆمەڵە چیرۆك.
- دەرگا – کۆمەڵە چیرۆك.
- سەعید زەبۆکی لای خۆمان – ڕۆمان.
- ترچێو – کۆمەڵە چیرۆك.
- فەنتازیا– کۆمەڵە چیرۆك
- هونەر نیگار کێشانی منداڵان.
- چەند وێستگەیەك.....ژیان‌و بیرەوەری

**توێژینەوە زانستییە بڵاوکراوەکانی:**

- ئازادیی ڕۆژنامەگەری، ڕای گشتی‌و دیموکراسییەت– گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە ٢٥ پاییزی ٢٠٠٢.
- ئازادیی ڕۆژنامەگەری‌و ئەخلاقی پیشە– گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارە ٢٧ لە بەهاری ٢٠٠٣.
- حقوق الانسان ومعاييرها الدولية – گۆڤاری یاساو ڕامیاری ساڵی دووەم کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤.
- حقوق الانسان في المذاهب الفكرية– گۆڤاری تەرازوو ساڵی ٢٠٠٥.

- دراسة شرعية وقانونية للقوانين الحديثة الصادرة عن برلمان كوردستان العراق بصدد المرأة وتنظيم الاسرة الكوردستانية– بحث مشترك، گۆڤاری تەرازوو ساڵی ٢٠٠٥.
- سلطة الصحافة– گۆڤاری تەرازوو ژمارە ٣٦–٣٧ ساڵی ٢٠١٠.
- دور النفقات العامة في تنمية اقليم كوردستان– بحث مشترك
- حق الرد وحق التصحيح في المطبوعات الدورية، گۆڤاری (الحقوق) زانكۆی (البحرين) دەریدەکات، جلدی ١١ ژمارە ١ ساڵی ٢٠١٤.
- مجلس الامن الدولي ودوره في تسوية النزاعات، گۆڤاری (زانكو) زانكۆی (جامعة صلاح الدين – اربيل) دەریدەکات، ژمارە ٥٨ ساڵی ٢٠١٤ .

**ئەندامی ئەم کۆمەڵەو ڕێکخراوانەیە:**

–یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان.

–یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر.

–سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان.

–الجمعية العراقية لحقوق الانسان.

–سەندیکای هونەرمەندانی عیراقی.

**تێبینی:** سەرپەرشتی لەسەر حەوت ماستەرنامەو سێ ئەتروحەی دکتۆرا کردووە لە بواری یاسادا، هەروەها بەشداری کردووە لە لیژنەی تاوتوێکردنی زیاتر لە سی ماستەرنامەو تێزی دکتۆرا لە بواری یاسادا وەك سەرۆکی لیژنە یان ئەندام لیژنە.

## درەختی خانەوادەی دانەر[1]:

عەلی نانەکەلی

خدر — مەحمود — فەقێ ویسی — وەسمان

ئاری — شاری

زەینەل — ئەیوب

ئاری — سلێمان — حەمەد ئاغا

ابراهیم

سەعید

مەلا مستەفا

مەلا سەعید ١٨٨٥ — عەبدوللاّ ١٨٨٧ — سەعدی ١٩٣٠

فارس ١٩٥٥ — کەمال ١٩٥٦ — ئامینە ١٩٥٨ — گولیزار ١٩٦٣ — جەمال ١٩٦٦ — لوقمان ١٩٧٠ — رۆناك ١٩٧٥

هەڤرس ١٩٨٢ — هەوراز ١٩٨٣ — هۆزاك ١٩٨٤ — هەوەس ١٩٨٩ — هەژا ١٩٩١

صفاء ٢٠٠٦ — لاوەند ٢٠١٤

ژاڵە ١٩٨٠ — چیایی ١٩٨٢ — ئالاّ ١٩٩٢ — محەمەد ١٩٩٣

پاشا ٢٠١٠ — هێژا ٢٠١٤

[1] تێبینی: ئەم درەختە بە دەسکاریەوە لە کتابی (هۆزی نانەکەلی) دانانی لوقمان فاروق حسن نانەکەلیو ئاری فاروق حسن نانەکەلی، چاپخانەی مێگا– ئەستەنبۆل– تورکیا، ٢٠١٤ وەرگیراوە.

# پێرســـت